بسم الله الرحمن الرحيم

## سێ بنچینەکان (الأصول الثلاثة)

**کە واجبە لەسەر هەموو موسلمانێك بیانزانێت: بریتین لە: بەندە پەروەردگارەکەی بناسێت "واتە ناسینی الله تعالی"، وە دینەکەشی کە ئیسلامە، وە پێغەمبەرەکەشی کە محمدە صلی الله علیه وسلم .**

**ئەگەر هاتوو پێیان وتیت: کێ پەروەردگارتە؟ ئەوا بلێ: الله پەروەردەگاری منە، کە پەروەردەی کردووم وە پەروەردگاری هەموو جیهانیانە بەنیعمەتەکانی، هەر ئەویش پەرستراوی منە، هیچ پەرستراوێکم نییە بێجگە لەو (واتە بێجگە لە الله تعالی هیچ پەرستراوێکی دیکەم نییە) .**

**وە ئەگەر پێیان وتیت: دینەکەت کامەیە؟ ئەوا بلێ: دینەکەم ئیسلامە، کە بریتیە لە: خۆبەدەستەوەدان بۆ الله تعالی بەتەوحید (بەتاك و تەنها پەرستنی الله تعالی)، وە ملکەچبوون پێیەوە بەگوێڕایەلیکردنی، وە دوورکەوتنەوە لەهاوبەش دانان بۆ الله تعالی و ئەو کەسانەش کە هاوبەشی بۆ پەیدا دەکەن .**

**وە ئەگەر پێیان وتیت: پێغەمبەرەکەت کێیە؟ ئەوا بلێ: محمد "صلی الله علیه وسلم" کوڕی عبدالله کوڕی عبدالمطلب کوڕی هاشم، وە هاشمیش لە قوڕەیشە، وە قوڕەیشیش لەعەرەبە، وە عەرەبیش لەنەوەی إسماعیلی کوڕی إبراهیمە "سەلامی الله تعالی لەسەر ئەوان و باشترین سلاویش بۆ پێغەمبەرمان صلی الله علیه وسلم".**

## بنچینەی دین لەسەر دوو شت دامەزراوە (أصل الدین وقاعدته):

**یەکەم: فەرمانکردن بەپەرستنی الله تعالی بە تاك و تەنها کە هیچ هاوبەشێکی بۆ نییە، وە هاندان "هاندانی خەلك" لەسەر پەرستنی الله تعالی بەتاك و تەنها، وە دۆستایەتیکردنی ئەو کەسانەی کەوا الله تعالی بەتاك و تەنها دەپەرستن، وە تەکفیرکردنی "بێباوەڕکردنی" ئەو کەسانەی واز لەم پەرستنە دەهێنن کە بریتیە لەپەرستنی الله تعالی بەتاك و تەنها .**

**دووەم: وریاکردنەوە "وریاکردنەوەی خەڵك" لەهاوبەشدانان بۆ الله تعالی لەپەرستنیدا، وە زەبری و توندی نواندن لەسەر ئەو کەسانەی کەوا هاوبەش بۆ الله تعالی دادەنێن، وە دوژمنایەتیکردنی ئەو کەسانەی کەوا هاوبەش بۆ الله تعالی دادەنێن، وە تەکفیرکردنی "بێباوەڕکردنی" ئەو کەسانەی کەوا هاوبەش بۆ الله تعالی ئەنجامدەدەن .**

# مەرجەکانی لا إله إلا الله (شروط لا إله إلا الله)

یەکەم: زانین و زانیاری ماناکەی بەلادان و جێگیرکردنی .
دووەم: دلنیابوون، کە بریتیە لەزانیارییەکی تەواو دەربارەی (لا إلـه إلا الله)، کە دژی دوودلی و گومانە .
سێیەم: نیازپاکی کە دژی هاوبەش پەیداکردنە .
چوارەم: ڕاستگۆیی کە دژی درۆیە .
پێنجەم: خوشەویستی بۆ ئەم وشەیە واتە بۆ (لا إلـه إلا الله) وە بۆ ئەو شتانەش کەوا بەلگەن لەسەری و دلخۆشبوون پێیانەوە .
شەشەم: ملکەچبوون بۆ مافەکانی، کە ئەویش بریتیە لەوەی هەموو کردارە پێویستییەکان بەنیازپاکی تەنها بۆ الله تعالی ئەمجامبدرێن و داواکردنی ڕەزامەندبوونی .
حەوتەم: ڕازیبوون کە دژی ڕەتکردنەوەیە .

## بەلگە لەسەر ئەم مەرجانە لە کتابی الله تعالی و سوننەتی پێغەمبەرەکەیدا صلى الله عليه وسلم

**یەکەم: بەلگەی زانین و زانیاری:** الله تعالى فەرموویەتی: (فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَـهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ وَلِلْمُؤْمِنِينَ وَالْمُؤْمِنَاتِ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مُتَقَلَّبَكُمْ وَمَثْوَاكُمْ)،"سورة محمد:19".

واتە: (بزانە خوا و پەرستراوی بەهەق، هەر (الله) یە: {فاعلم أنه لا إله إلا الله} جا ئەی موحەممەد! (صلى الله عليه وسلم) ئەی ئینسان! بزانە کە بێگومان جگە لە (الله) هیچ پەرستراوێکی هەق نیە مافی پەرستنی ببێ، دەسا تۆش لەسەر ئەو بیروباوەڕە سابت بەو، هەرگیز نەگۆڕێیت {واستغفر لذنبك وللمؤمنين والمؤمنات} وە بۆ خۆت و ئیمانداران لە پیاوان و ژنان داوای لێبوردنی گوناهان بکە، {والله يعلم متقلبكم و مثواكم} وەخوا خۆی چاك دەزانێت ئێوە چۆن هەڵدەسوڕێن و، چۆن ئیسراحەت ئەکەن، وە بە ڕۆژوو بەشەو چی ئەکەن، واتە: هەموو ئەحواڵتان ئەزانێ و هیچی لێشاراوە نیە).

وه هەر الله تعالى فەرموویەتی: (وَلَا يَمْلِكُ الَّذِينَ يَدْعُونَ مِن دُونِهِ الشَّفَاعَةَ إِلَّا مَن شَهِدَ بِالْحَقِّ وَهُمْ يَعْلَمُونَ)،"سورة الزخرف:86".
واتە: ({ولا يملك الذين يدعون من دونه الشفاعة} وه پەرستراوانەی ئەوان لەباتی خوا هاواریان لێ دەکەن و ئەیانپەرستن دەسەڵاتی شەفاعەت و تکایان نییە {إلا من شهد بالحق} بەڵام کەسێك شایەتی بە هەق دابێ و بڕوای هێنابێت وەك فریشتەکان و عوزەیرو عیسا ئەوانە دەتوانن داوای شەفاعەت بکەن {وهم يعلمون} وەئەوان ئەزانن هەقیقەتی شایەدەکەیان).
(وهم يعلمون) واته بە (لا إله إلا الله) بەدلیان بیزانن و باوەڕی پێ هەبێت ئەوەی کەوا بەزمانیان دەریدەبڕن و دەیلێن .

وه بەلگە لەسوننەتیشدا: لەصحیحی موسلیمدا هاتووه کەوا عثمان "رضي الله عنه" فەرموویەتی: کەوا پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" فەرموویەتی: (من مات وهو يعلم أنه لا إله إلا الله دخل الجنة)، واتە: (هەرکەسێك بمرێت و بزانێت کەوا هیچ پەرستراوێکی حەق نییە کەوا شایەنی پەرستن بێت تەنها الله نەبێت ئەوا دەچێتە بەهەشتەوه).

دووەم: بەلگەی دلنیابوون: الله تعالى فەرموویەتی: (إِنَّمَا الْمُؤْمِنُونَ الَّذِينَ آمَنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ ثُمَّ لَمْ يَرْتَابُوا وَجَاهَدُوا بِأَمْوَالِهِمْ وَأَنفُسِهِمْ فِي سَبِيلِ اللَّهِ أُوْلَئِكَ هُمُ الصَّادِقُونَ)،"سورة الحجرات:15".
واتە: ({إنما المؤمنون الذين آمنوا بالله ورسوله} بێگومان بڕوادارەکان تەنها ئەو کەسانەن کە باوەڕیان بەخواو بەپەیامبەری خوا هێناوه {ثم لم يرتابوا} لەپاشا گومانیان نەبوو لە ئیمانە کەیاندا {وجاهدوا بأموالهم وأنفسهم في سبيل الله} و بە سامان و گیانیانەوه جیهادیان کرد لە ڕێی خوادا {أولئك هم الصادقون} هەر ئەوکەسانەشن ڕاستگۆیان لەداوای بڕوادا، بڕواش هەر ئاوا ئەبێت).

مەرجی ڕاستگۆیی لەباوەڕهێنان بە الله تعالى و پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" ئەوەیە کەوا دوودلی و گومانی تێدا نەبێت، بەلام ئەو کەسەی کەوا دوودلی و گومانی هەبێت ئەوا لەمونافیقەکانە (دووڕووەکان).

وه بەڵگە لەسوننەتیشدا: لە صحیحی موسلیمدا هاتووە کەوا أبو هريرة "رضي الله عنه" فەرموویەتی: کەوا پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" فەرموویەتی: (أشهد أن لا إله إلا الله وأني رسول الله لا يلقى الله بهما عبد غير شاك فيهما إلا دخل الجنة)، واتە: (شایەدی دەدەم بەوەی کە هیچ پەرستراوێکی حەق نییە کەوا شایەنی پەرستن بێت تەنها الله نەبێت وە شایەدی دەدەم کەوا من نێردراوی خوام "صلى الله عليه وسلم" هیچ بەندەیەك نییە ئەم دوو شایەدیەی دابێت و بگاتەوە بەخوا و هیچ گومان و دوودڵی تێدا نەبووبێت ئەوا بەدڵنیاییەوە دەچێتە بەهەشتەوە).

وە لەگێرانەوەیەکی تردا هاتووە کەوا پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" فەرموویەتی: (لا يلقى الله بهما عبد غير شاك فيهما فيحجب عن الجنة)، واتە: (هیچ بەندەیەك نییە کەوا ئەم دوو شایەدیەی دابێت و بگاتەوە بەخوا و هیچ دوودڵی و گومانی تێدا نەبووبێت بەهەشتی لێ قەدەغە بکرێت).

سێیەم: بەڵگەی نیازپاکی: الله تعالى فەرموویەتی: (أَلَا لِلَّهِ الدِّينُ الْخَالِصُ وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ أَوْلِيَاء مَا نَعْبُدُهُمْ إِلَّا لِيُقَرِّبُونَا إِلَى اللَّهِ زُلْفَى إِنَّ اللَّهَ يَحْكُمُ بَيْنَهُمْ فِي مَا هُمْ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ إِنَّ اللَّهَ لَا يَهْدِي مَنْ هُوَ كَاذِبٌ كَفَّارٌ)،"سورة الزمر:3".
واتە: ({الا لله الدين الخالص} هۆشیاربە! ئایینی پاك و چاك و بێگەرد تەنها هی خوایە. واتە: خوا تەنها هەر ئیخلاص وەرئەگرێ و، هەرشتێکی دی وەلا دەنێ {والذين اتخذوا من دونه أولياء} ئەوانەی کە لەباتی خوا چەند دۆست و بتێکیان بۆ خۆیان گرتووە، وەبەبێ هیچ بەڵگەیەکیش ئەڵێن: {ما نعبدهم إلا ليقربونا إلى الله زلفى} ئێمە هەر بۆئەوە ئەو بتانە دەپەرستین، کە لەخوامان نزیك بکەنەوەو ، تکامان بۆ بکەن لای، {إن الله يحكم بينهم في ما هم فيه يختلفون} جا با هەر وابکەن بێگومان خوا هەق و ناهەق جیا ئەکاتەوەو، بڕیاری خۆی دەربارەی ئەو دوو بەرەکیەی نێوانیان دەدات، ئەو کات موسڵمانان ئەچنە بەهەشتەوەو، بێ بڕوایانیش بۆ دۆزەخ ئەنێردرێن {إن الله لا يهدي من هو كاذب كفار} دیارە ئەوجۆرە کەسانە گومڕاو سەر لێشێواون ، خۆبەڕاستی خوایش مرۆی درۆزن و سپڵە ڕێنوێن ناکا).

وه هەر الله تعالى فەرموویەتی: (وَمَا أُمِرُوا إِلَّا لِيَعْبُدُوا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ حُنَفَاء وَيُقِيمُوا الصَّلَاةَ وَيُؤْتُوا الزَّكَاةَ وَذَلِكَ دِينُ الْقَيِّمَةِ)،"سورة البينة:5".
واتە: ({وما أمروا} لە هەمان کاتا لە (تەورات و ئینجیل) دا فرمانیان پێ نەدرابوو {ألا ليعبدوا الله مخلصين له الدين} بەوە نەبێ کە بەتەواوی هەموو خواپەرستن و سەر بۆئەو دانەوێنن و ئایینی خالیس هەر بۆئەو دابنێن {حنفاء} و لەهەموو ئایینێکی هیچ و پوچ لابدەن {ويقيموا الصلاة} و بەتێرو تەسەل نوێژەکانیان بکەن {ويؤتوا الزكاة} لەماڵ و سامانیان زەکات بدەن بەو شێوەیەی بۆیان روون کراوەتەوە {وذلك دين القيمة} وەهەر ئەوخوا پەرستیی و یەکلا بوونەوەیەو نوێژو زەکات دانەیە ئایینی پایەدارو راستە، ئاوا فرمانیان پێکرابوو، کەچی ئەوان جیابوونەوەو بوونە چەند دەستەیەك).

وه بەڵگە لەسوننەتیشدا: لە صحیحی بوخاریدا هاتووە لە ئەبی هورەیرەوە "رضي الله عنه" ئەویش لەپێغەمبەرەوە "صلى الله عليه وسلم" کەوا فەرموویەتی: (أسعد الناس بشفاعتي يوم القيامة من قال لا إله إلا الله خالصا من قلبه " أو نفسه")، واتە: (بەختەوەرترین کەس لەڕۆژی قیامەتتدا بە شەفاعەتکردنی من ئەو کەسەیە کەوا بەنیازپاکی و بەدلسۆزی لەدڵەوە "یاخود لەدەروون و ناخییەوە" وتبێتی لا إله إلا الله "واتە وتبێتی هیچ پەرستراوێکی حەق نییە کەوا شایەنی پەرستن بێت تەنها الله نەبێت").

وه لەهەردوو صحیحی بوخاری و موسلیمیشدا هاتووە لەعوتبانی کوڕی مالیکەوە "رضي الله عنه" ئەویش لەپێغەمبەرەوە "صلى الله عليه وسلم" کەوا فەرموویەتی: (إن الله حرم على النار من قال لا إله إلا الله يبتغي بذلك وجه الله عز وجل)، واتە: (الله تعالى حەرامی کردووە و قەدەغەی کردووە لەسەر ئاگری دۆزەخ کە کەسێك بچێتە ناویەوە و کەسەکە وتبێتی لا إله إلا الله "واتە وتبێتی هیچ پەرستراوێکی حەق نییە کەوا شایەنی پەرستن بێت تەنها الله نەبێت" و مەبەست لەم وتنەشی تەنها ڕەزامەندی الله تعالى بێت).

وه هەروەها النسائي لە (اليوم والليلة) لەفەرموودەی دوو پیاو لەهاوەڵەکان ئەوانیش لەپێغەمبەرەوە "صلى الله عليه وسلم" کەوا فەرموویەتی: هەرکەسێك

بلێت (قال لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير مخلصا بها قلبه، يصدق بها لسانه إلا فتق الله لها السماء فتقا، حتى ينظر إلى قائلها من أهل الأرض، وحق لعبد نظر الله إليه أن يعطيه سؤله)، واته: (هیچ پەرستراوێکی حەق نییه کەوا شایەنی پەرستن بێت تەنها الله نەبێت و تاکه و هیچ هاوبەشێکی نییه، هەرچی مولك و سامان و دەستەلاتە هی ئەوە و هەرچی سوپاس و ستایش هەیه هەر بۆ ئەوە وە هەر ئەویشە دەستەلاتی بەسەر هەموو شتێکدا هەیه، بەدلسۆزی و نیازپاکی و لەدلیشیەوە بێت و زمانیشی ڕاستگۆیەتی بسەلمێنێ ئەو بێگۆمان الله تعالى ئاسمانی بۆ لەت دەکات لەت کردنێك تا ئەو کەسە لێیەوە سەیری ئەو کەسە دەکات کە دەلێت "لا إله إلا الله وحده لا شريك له، له الملك وله الحمد وهو على كل شيء قدير" لەخەلکی سەر زەوی، وە هەر بەندەیەکیش الله تعالى سەیری بکات ئەوا مافی خۆیەتی هەر شتێك داوا بکات پێی ببەخشرێت).

چوارەم: بەلگەی ڕاستگۆیی: الله تعالى فەرموویەتی: (الم * أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ * وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ)،"سورة العنكبوت:1_2_3".
واته: ({ألم} واته: ئەم قورئانە هەر لەم پیتانە ڕێکخراوە، جا ئەگەر ئێوە ئەی خوانەناس و موشریکان! نکوولی دەکەن، دەسا فەرموون وێنەی بێنن * {أحسب الناس أن يتركوا أن يقولوا آمنا وهم لا يفتنون} ئاخۆ موسڵمانان - بەتایبەتی - موسڵمانانی مەککە، گومان وادەبەن کە ئەگەر هەر ئەوەندە بڵێن: بڕوامان هێناوە، ئیتر وازیان لێدەهێنرێ و، تاقییناکرێنەوە؟! نەخێر.. شتی وا نابێ و نەبووە بەڵکو پێویستە خەڵکی موسڵمان تاقی بکرێنەوەو، لە بەرامبەریشیەوە، ئارامیان ببێ * {ولقد فتنا الذين من قبلهم} بە هەقیقەت ئێمە ئەوانەی پێش ئەوانمان - وەك ئیبراهیم ی خەلیل و، چەند گەلێکی دی- تاقیکردنەوە بەجۆرەها مەینەت و بەڵا؛ کەچی کۆڵیشیان نەدا، لەفەرموودەیەکی ڕاست و دروستدا هاتووە کە: (أشدُّ الناس بلاء، الأنبياءُ، ثم الصالحون، ثم الأمثلُ فالأمثلُ، يُبْتلى الرجلُ على حَسَبِ دينه، فإن كان في دينه صَلابةٌ زيد له في البلاء). پێشەوا ئەحمەد. دە کەوابوو هەردەبێ ئەزموون و تاقیکردنەوە ببێ، هەرچەند ئەوکەسە پلەی بەرزیشی هەبێ لە

ئاییندارِیدا، بگره تا پلەی بەرزتربێ، ئەزموونەکەشی سەختر دەبێ. {فليعلمن الله الذين صدقوا} بێگومان خوا بەواقیعیی کەسانێك کەڕاستیان وتووەو بڕوایان هێناوە دیاریدەکا، واتە: تا بەخەڵکیان بناسێنێ و، بۆخۆیشیان بزانن کە چ پیاوێکن؟! {وليعلمن الكاذبين} وە درۆزنانیش دیاری دەکا، تا بناسرێن و دەرکەون. واتە: تاباوەڕدارێ ڕاستەقینە لەبڕواداری ناراست، بۆخەڵکی لێك بکرێتەوە).

وە هەر الله تعالی فەرموویەتی: (وَمِنَ النَّاسِ مَن يَقُولُ آمَنَّا بِاللّهِ وَبِالْيَوْمِ الآخِرِ وَمَا هُم بِمُؤْمِنِينَ * يُخَادِعُونَ اللّهَ وَالَّذِينَ آمَنُوا وَمَا يَخْدَعُونَ إِلاَّ أَنفُسَهُم وَمَا يَشْعُرُونَ * فِي قُلُوبِهِم مَّرَضٌ فَزَادَهُمُ اللّهُ مَرَضاً وَلَهُم عَذَابٌ أَلِيمٌ بِمَا كَانُوا يَكْذِبُونَ)، "سورة البقرة:8_9_10".

واتە: ({ومن الناس من يقول آمنا بالله وباليوم الآخر} لەو خەڵکانەدا کەسانێك هەن دەڵێن: باوەڕمان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە {وما هم بمؤمنين} کەچی درۆ دەکەن و، لەڕاستییدا بڕوایان نییە، بەڵکو دەیانەوێ ئێوە فریو بدەن و، وردە وردە لێتان نزیك ببنەوەو، لە دژتان پیلان بگێڕن و، پشێوی بخەنە ناوتانەوەو ڕیزەکانتان تێك بدەن * {يخادعون الله والذين آمنوا} ئەوانە بەنیازی خۆیان دەیانەوێ فێڵ و تەڵەکە لەگەڵ خوداو ئەوکەسانەدا بکەن کە بڕوایان هێناوە {وما يخدعون إلا أنفسهم} بەڵام لەڕاستییدا تەنها لەگەڵ خۆیان فێڵ وفەرەج ئەکەن و زیانەکەشی هەر بۆ خۆیان ئەگەڕێتەوەو تەنها خۆیان دەخەڵەتێنن {وما يشعرون} لە حاڵێکدا هەستیش بەو ڕاستییە ناکەن! * {في قلوبهم مرض} دڵیان دەردو نەخۆشیی و حەسوودییو گومان و ناپاکیی تێدایە {فزادهم الله مرضا} جاخوایش ڕۆژ لەدوای ڕۆژ دەردو نەخۆشییەکەیانی زیاد کردن، جگە لەوەیش {ولهم عذاب أليم} سزایەکی سەخت و ئێش پێگەیەنەریان بۆهەیە {بما كانوا يكذبون} لەبەر ئەوە کەدرۆیان کرد، بەتایبەت ئەو دەمەی کە دەیانگوت بڕوامان بەخواو بەڕۆژی دوایی هەیە).

وە بەڵگە لەسوننەتیشدا: لەهەردوو صحیحی بوخاری و موسلیمدا جێگیربووە لە موعاذي کوڕی جەبەلەوە "رضي الله عنه" ئەویش لەپێغەمبەرەوە "صلى الله عليه وسلم" کەوا فەرموویەتی: (ما من أحد يشهد أن لا إله إلا الله، وأن محمدا

عبده ورسوله، صادقا من قلبه، إلا حرمه الله على النـار)، واتـه: (هیچ كەسێك نییە كەوا شایەدی بدات بەوەی كە هیچ پەرستراوێكی حەق نییە كەوا شایەنی پەرستن بێـت تەنهـا الله نەبێـت وە محمـدیش بەنـدە و نێـردراوی الله یە، ئەم شـایەدییەش بەدلسۆزی و نیازپـاكی لەدلیـەوە بێت، ئەوا بێگومـان الله تعالی حەڕامـی دەكـات و قەدەغەی دەكات لەوەی بچێتە نـاو ئاگری دۆزەخەوە).

پێنجەم: بەڵگەی خۆشەویستی: الله تعالی فەرموویەتی: (وَمِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَندَاداً يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلّهِ وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلّهِ جَمِيعاً وَأَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ)،"سورة البقرة:165".
واتـە: ({ومـن النـاس مـن یتخـذ مـن دون الله أنـدادا} هەنـدێ لـەم خەڵـكە هەیـە لەگەڵ ئەوەشدا تێنافكرێ تاخوا بەتەنها بپەرستـێ، هێشـتا چەند هاوتـاو چەند هاوبەشێكی بۆ دادەنـێ {یحبونـهم كحب الله} خۆشیـان دەوێـن وەك خۆشەویستـی خـودا، واتـە: ئەوانیش هەر ئەوەنـدە بـت و بەرنـامەكانیـان خـۆش دەوێ {والـذین آمنـوا أشـد حبـا لله} ئـەوانـەش وا بـاوەڕیـان هێنـاوە، خوایـان لەهەمـوو شـتێك زیـاتر خـۆش دەوێ {ولو یری الذین ظلموا إذ یرون العذاب أن القوة لله جمیعا} ئـەوانـە وا ستەمیانكرد و هاوبەشـیان بـۆ خـوا دانـا، كـاتێ ئەو ڕۆژە سـەخت و سـزایە دەبیـنن كەلەقیامەتـدا دووچاریان دەبێ، ئیتـر چاك بۆیان دەردەكـەوێ و دەزانـن: كەهەرچی هێزو توانـا هەیە هەرهەموو بۆخوایە {وأن الله شدید العذاب} و سزای خواش تونـدو قـورس و سەختە، ئیتر ئەمرۆ لەدنیادا لەو شیرك وسەر لێشێواوییە دەهاتنە دەرێ).

وە هەر الله تعالی فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ مَن يَرْتَدَّ مِنكُمْ عَن دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللّهِ وَلاَ يَخَافُونَ لَوْمَةَ لآئِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللّهِ يُؤْتِيهِ مَن يَشَاء وَاللّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ)،"سورة المائدة:54".
واتـە: ({یا أیها الـذین آمنـوا} ئەی ئەوكەسانەی باوەڕتـان هێنـاوە! {من یرتـد منكم عن دینـه} هەركەسێكتان لەئـاییـنی خـۆی، واتـە: لەدینـی ئیسلام پاشـگەز بێتەوەو وەرگەڕێ {فسـوف یـأتی الله بقـوم} جـا خـوا لەمەولا كەسـانێك دێنێـت، ئەوەنـدە بەرفەرمـانی دەبـن {یحـبهم و یحبونـه} خۆشـی دەوێـن و، ئەوانـیش ئەویـان

خۆشدەوێ {أذلة على المؤمنين} و لەئاستی خاوەن باوەڕاندا، خۆ بەکەمزان و بەسۆزن {أعزة على الكافرين} و بەرامبەر بە کافرو بێ باوەڕان، خۆ بەگەورەزان و سەربڵندو دەروون بەرزن و، توندوتیژو بەهەڵمەتن {يجاهدون فی سبيل الله} بۆ ڕەزامەندی خواش تێدەکۆشن و جەنگ دەکەن {ولا يخافون لومة لائم} و لە تەشەرو لۆمەی لۆمەکەرانیش ناترسن و باکیان نابێ، {ذلك فضل الله يؤتيه من يشاء} ئەو خۆشەویستی و تێکۆشانە، فەزڵ و بەخششی خوایە، بەهەرکەسێك خۆی بییەوێ دەیدا {والله واسع عليم} و خواش فەزڵ و میهرەبانی فراوانە، زۆریش زانایە، دەزانێ کێ شایستەی ئەو بەخشینەیە).

وە بەڵگە لەسوننەتیشدا: لەهەردوو صەحیحی بوخاری و موسلیمدا هاتووە لەئەنەسەوە "رضي الله عنه" ئەویش لەپێغەمبەرەوە "صلى الله عليه وسلم" کەوا فەرموویەتی: (ثلاث من كن فيه وجد حلاوة الإيمان: أن يكون الله و رسوله أحب إليه مما سواهما، وأن يحب المرء لا يحبه إلا لله، وأن يكره أن يعود في الكفر بعد إذ أنقذه الله منه كما يكره أن يقذف في النار)، واتە: (سێ خەسلەت هەن لەهەرکەسێکدا هەبن ئەوا تام و چێژی ئیمانی چەشتووە و سێ خەسلەتەکەش بریتین لەوەی کەوا الله و پێغەمبەرەکەی "صلى الله عليه وسلم" لەهەموو شتێك خوشتربووێت، وە ئەگەر کەسێکی خوشویست ئەوا خوشی نەوێت تەنها لەبەر الله نەبێت، وە پێی ناخۆشبێت بگەڕێتەوە بۆ کوفر و بێباوەڕی پاش ئەوەی کەوا الله تعالى ڕزگاری کردووە لێی هەروەکو چۆن پێی ناخۆشبێت فڕێبدرێتە "بهاوێژرێتە" ناو ئاگرەوە).

شەشەم: بەڵگەی ملکەچبوون: الله تعالى فەرموویەتی: (وَأَنِيبُوا إِلَى رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا لَهُ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ الْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ)،"سورة الزمر:54".

واتە: ({وأنيبوا إلى ربكم وأسلموا له} بگەڕێنەوەو بۆلای خواوەندتان و ملکەچی فەرمانی ئەوبن {من قبل أن يأتيكم العذاب} پێش ئەوە سزاکەتان بۆ بێ {ثم لا تنصرون} دواییش ئیتر لەلایەن هیچ کەسێکەوە یارمەتی نادرێن).

وە هەر الله تعالى فەرموویەتی: (وَمَنْ أَحْسَنُ دِينًا مِّمَّنْ أَسْلَمَ وَجْهَهُ لله وَهُوَ مُحْسِنٌ واتَّبَعَ مِلَّةَ إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا وَاتَّخَذَ اللّهُ إِبْرَاهِيمَ خَلِيلاً)،"سورة النساء:125".

واته: ({ومن أحسن دينا ممن أسلم وجهه لله وهو محسن} ئاخۆ دینداریك هەبێ ئایینی لەوكەسە باشترو چاكتر بێ كەخۆی دابێتە دەستی خواو ئاكار چاكیش بێ {واتبع ملة إبراهيم حنيفا} و كەوتبێتە شوێنی ئایینی پاكی ئیبراهیمێ كە لەهەمووشتێ لایدابێ و، هەر تەنها بەرەوخوا هاتبێ؟ {واتخذ الله إبراهيم خليلا} لەكاتێكدا خوا ئەو ئیبراهیمەی كردۆتە دۆست و خۆشەویستی خۆی، دەسا ئێوە پەیرەویی لێبكەن).

وە هەر الله تعالى فەرموویەتی: (وَمَن يُسْلِمْ وَجْهَهُ إِلَى اللَّهِ وَهُوَ مُحْسِنٌ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَى وَإِلَى اللَّهِ عَاقِبَةُ الْأُمُورِ)،"سورة لقمان:22".
واته: ({ومن يسلم وجهه إلى الله} هەر كەسێك كە بەتەواوی و بەدڵێكی پاكەوە ڕوویكاتە خوا {وهو محسن} و چاكەكاریش بێت { فقد استمسك بالعروة الوثقى} بێگومان دەستی بە قوڵپی هەرە پتەوەوە گرتووە كە دەیگەیەنێ بەخوا، هەرچۆن كەسێك بەشاخێكدا سەركەوێ، یان دابەزێ، دەست بە ئاڵقەیەكی زۆر قایمەوە دەگرێ، دیارە ئەمیش بەهێزترین ڕێگا و ڕێبازی بۆ خۆی هەڵبژاردووە {وإلى الله عاقبة الأمور} وە ئەنجامی هەموو كاریكیش هەر بۆ لای خوایە).

وە هەر الله تعالى فەرموویەتی: (فَلاَ وَرَبِّكَ لاَ يُؤْمِنُونَ حَتَّىَ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاَ يَجِدُواْ فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسْلِيمًا)،"سورة النساء:65".
واته: (تا شەرعی خوا نەكەنە بەرنامە، موسڵمان نین: {فلا وربك لا يؤمنون} نەخێر وەك ئەوە نییە دووڕووەكان دەیزانن، سوێندبێ بەپەروەردگارت ئەی پێغەمبەر نابنە باوەڕدار {حتى يحكموك فيما شجر بينهم} تا بۆ یەكلاكردنەوەی كێشەكانی نێوانیان تۆ دەكەنە داوەر {ثم لا يجدوا في أنفسهم حرجا مما قضيت} و ئەوساش بەرامبەر بەوبڕیارەی تۆ داوتە, هیچ تەنگیەكیان دەست نەكەوێ لەدەروونیاندا {ويسلموا تسليما} و بەچاكیش تەسلیم و ملكەچ ببن).

وە بەڵگە لەسوننەتیشدا: فەرموودەی پێغەمبەرە "صلى الله عليه وسلم" كەوا فەرموویەتی: (لا يؤمن أحدكم حتى يكون هواه تبعا لما جئت به)، إسناده ضعيف،

واتە: (هیچ کەسێك لەئێوە ئیمانی تەواو نابێت تا نەفس و ئارەزووی شوێنکەوتووی ئەوە نەبێت کە من هێناومە)، ئەمە بریتیە لەتەواو ملکەچبوون و خۆبەدەستەوەدان و ئامانجەکەی .

حەوتەم: بەلگەی ڕازیبوون: الله تعالى فەرموویەتی: (وَكَذَٰلِكَ مَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِي قَرْيَةٍ مِّن نَّذِيرٍ إِلَّا قَالَ مُتْرَفُوهَا إِنَّا وَجَدْنَا آبَاءنَا عَلَى أُمَّةٍ وَإِنَّا عَلَى آثَارِهِم مُّقْتَدُونَ * قَالَ أَوَلَوْ جِئْتُكُم بِأَهْدَى مِمَّا وَجَدتُّمْ عَلَيْهِ آبَاءكُمْ قَالُوا إِنَّا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ كَافِرُونَ * فَانتَقَمْنَا مِنْهُمْ فَانظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ)،"سورة الزخرف:23_24_25".

واتە: ({وكذلك ما أرسلنا من قبلك في قرية من نذير} وەبەو تەرزەی ئەمانە، هەر پەیامبەرێکی ترسێنەرمان - لەپێشتەوە- ناردووە بۆ شارێك {إلا قال مترفوها} خۆشگوزەرانەکانیان بەگوێیان نەکردووەو وتویانە: {إنا وجدنا آباءنا على أمة} بەڕاستی ئێمە باوو باپیرانمان دیتووە لە سەر مەزهەب و ئایینێك {وإنا على آثارهم مقتدون} و ئێمەیش بە شوێن ئەواندا ئەڕۆین و پێڕەویان ئەکەین * {قال أولم جئتكم بأهدى مما وجدتم عليه آباءكم} پێغەمبەرەکەش وتوویەتی: باشە ئەگەر من بەرنامەو ئایینێکی باشترم لەوەی باوو باپیرانتان بۆ هێنان ئێوە هەر نکوڵی ئەکەن ؟! {قالوا إنا بما أرسلتم به كافرون} لەوەڵامدا وتوویانە: بێگومان ئێمە بەو بەرنامەی ئێوە پێی نێرراون باوەڕ ناکەین! * {فانتقمنا منهم} ئینجا ئێمەش تۆڵەمان لێ ساندن {فانظر كيف كان عاقبة المكذبين} جا سەرنج بدە، بزانە دەرەنجامی بێ باوەڕان و بەدرۆخەرەوان چۆن بوو؟).

الله تعالى فەرموویەتی: (إِنَّهُمْ كَانُوا إِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا إِلَٰهَ إِلَّا اللَّهُ يَسْتَكْبِرُونَ * وَيَقُولُونَ أَئِنَّا لَتَارِكُوا آلِهَتِنَا لِشَاعِرٍ مَّجْنُونٍ)،"سورة الصافات:35_36".
واتە: ({إنهم كانوا إذا قيل لهم لا إله إلا الله يستكبرون} چونکە ئەوان کاتێ پێیان گوترابا: هیچ پەرسراوێکی هەق نیە جگە لە (الله)، ئیبایان دەکرد و خۆیان زۆر بەزل دەزانی * {ويقولون أإنا لتاركوا آلهتنا لشاعر مجنون} و دەشیان گوت: ئایا ئێمە بۆشاعیرێکی شێت و لێوە وەکو موحەممەد، واز لەخواکانمان بێنین؟!).

وە بەڵگە لەسوننەتیشدا: لەهەردوو صحیحی بوخاری و موسلیمدا جێگیربووە لە ئەبی موساوە "رضي الله عنه" ئەویش لەپێغەمبەرەوە "صلى الله عليه وسلم" کەوا فەرموویەتی: (مثل ما بعثني الله به من الهدى و العلم كمثل الغيث الكثير أصاب أرضا، فكان منها نقية قبلت الماء فأنبتت الكلأ و العشب الكثير، وكانت منها أجادب أمسكت الماء فنفع الله بها الناس، فشربوا وسقوا وزرعوا، وأصاب منها طائفة أخرى، إنما هي قيعان لا تمسك ماء، ولا تنبت كلأ، فذلك مثل من فقه في دين الله نفعه ما بعثني الله به فعلم وعمل، ومثل من لم يرفع بذلك رأسا ولم يقبل هدى الله الذي أرسلت به)، واتە: (نموونەی ئەوەی کەوا الله پێی ڕەوانەکردووم بۆ خەڵکی لەڕێنوێنی و زانست وەکو بارانێکی زۆرە کەوا ببارێتەوە سەر زەوییەك، جا هەندێك لەو زەوییە پاك و بێگەرد و خاوێنە ئاوەکە وەردەگرێت و هەڵیدەمژێت و لەو زەوییەدا گژوگیایەکی زۆری لێ دەڕوێت، بەشێکی تر لەزەوییەکە بێ پیتە و بەرەکەتە واتە هیچی تیادا ناڕوێت بەڵام ئاوەکە لەخۆیدا هەڵدەگرێت، تیایدا دەوەستێت، بەهۆیەوە الله تعالی سوود بەخەڵك دەگەیەنێت و خەڵکیش لێی دەخۆنەوە و ئاژەڵەکانیان پێی ئاو دەدەن و کشتوکاڵیشی لێ دەکەن، وە بڕێکی تر لەم بارانە دەکەوتە سەر بەشێکی تر لەزەوییەکە کە تەنها دەشت و بانێکی بێ خێرە و نەئاو دەگرێتە خۆی و نەگژوگیاشی لێ دەڕوێت، جا نموونەی ئەو سێ زەوییە وەکو نموونەی سێ کۆمەڵە خەڵك وان کە ئاینی خوایان پێگەیشتبێت جا هەندێکیان سوود وەردەگرێت لەوەی الله تعالی بەمندا ناردوویەتی خۆی فێر دەکات و خەڵکیش فێر دەکات، وە هەندێکیشیان سەری خۆیانی پێ بەرزناکەنەوە و فێری نابن و خەڵکیش فێر ناکەن، وە هەندێکیشیان هەر لەبنەڕەتەوە ئەو ئایین و ڕێنماییە وەرناگرێت کە من لەپێناویدا نێردراوم).

# هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام (نواقض الإسلام)

بزانە کەوا هەڵوەشێنەرەوەکانی ئیسلام دە (10) هەڵوەشێنەرەوەن
**هەڵوەشێنەرەوەی یەکەم:** هاوبەشدانان لەپەرستنی الله تعالی دا:
الله تعالی فەرموویەتی: (إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدِ افْتَرَى إِثْمًا عَظِيمًا)،"سورة النساء:48".
واتە: ({إن الله لا يغفر أن يشرك به} بێگومان هەرگیز خوا لەدانانی هاوبەش بۆی نابوورێ {ويغفر ما دون ذلك لمن يشاء} و لەخوار شیرکەوە لەهەر گوناهێك دەبوورێ بۆ هەرکەسێك خۆی بیەوێت {ومن يشرك بالله فقد افتري إثما عظيما} و هەر کەسێك هاوبەش بۆ خوا دابنێ, بەڕاستیی درۆ و گوناهێکی گەورەی کردووە).

وە هەر الله تعالی فەرموویەتی: (لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُواْ اللّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللّهُ عَلَيهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ)،"سورة المائدة:72".

واتە: ({لقد كفر الذين قالوا إن الله هو المسيح ابن مريم} عیسایییەکان ـ ئەوانەیان دەڵێن: خوا خۆی مەسیحی کوری مەریەمە- بێگومان کافرن، چونکە خوا بۆ خۆی تاك و تەنیایەو، (مەسیح)یش هێمان هەر لەبێشکەدا بوو گوتی: (إنی عبد الله آتانی الكتاب و جعلنی نبيا ) هەتا ئەوە کە گوتی: ( وإن الله ربی وربكم فاعبدوه هذا صراط مستقيم ) {وقال المسيح يا بنی إسرائيل} مەسیحیش کاتێ رەوانە کرا گوتی: ئەی نەوەکانی یەعقووب! {إعبدوا الله ربی و ربكم} دەبێ ئێوە هەر ئەوخوایە بپەرستن کە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە {إنه من يشرك بالله} چاك بزانن کە هەرکەسێك شەریك و هاوبەش بۆخوا دابنێ {فقد حرم الله عليه الجنة} بێ شك خوا بەهەشتی لەسەر یاساغ دەکا {و مأواه النار} جێ و شوێنی ئاگرە، {وما للظالمين من أنصار} ستەمکارانیش هیچ جۆرە یارمەتی دەرێکیان بۆ نییە و رزگار نابن).
وە لەوانەش: سەربڕین بۆ جگە لە الله تعالی وەکو سەربڕین بۆ جنوکە یاخود قەبر .

**هەڵوەشێنەرەوەی دووەم:** هەرکەسێك لەنێوان خۆی و الله تعالی دا کومەڵێك ناوەند و واسیتە دابنێ لێیان بپاڕێتەوە و داوای تکایان لێ بکات و پشتیان پێ ببەستێ ئەوا بەکۆدەنگی زانایان (إجماع) ئەو کەسە کافربووە .

**هەڵوەشێنەرەوەی سێیەم:** هەرکەسێك هاوبەشدانەران بەکافر نەزانێت یاخود گومانی هەبێت لەکافربوونیان یاخود ڕێچکە و ڕێبازەکەیان بەڕاست دابنێت ئەوا ئەو کەسە کافرە .

**هەڵوەشێنەرەوەی چوارەم:** هەرکەسێك باوەڕی وابێت کەوا ڕێبازی غەیری ڕێبازی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" تەواوترە لەڕێبازی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" یاخود حوکمی جگە لەحوکمی ئەو باشترە لەحوکمی ئەو وەکو ئەو کەسەی حوکمی طاغوتەکانی پێ باشترە لەحوکمی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" ئەوا ئەو کەسە کافرە .

**هەڵوەشێنەرەوەی پێنجەم:** هەرکەسێك شتێکی پێ ناخۆشبێت و ڕقی ببێتەوە لەوەی کەوا پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" هێناویەتی با کردەوەشی پێبکات ئەوا ئەو کەسە کافرە .

**هەڵوەشێنەرەوەی شەشەم:** هەرکەسێك گاڵتە بکات بەشتێك لە دینی پێغەمبەر "صلی الله علیه وسلم" یانیش بەپاداشتەکانی یانیش بەسزاکانی ئەوا ئەو کەسە کافرە، بەلگەش وتەی الله تعالی یە کەوا فەرموویەتی: (وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِؤُونَ * لاَ تَعْتَذِرُواْ قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ إِن نَّعْفُ عَن طَآئِفَةٍ مِّنكُمْ نُعَذِّبْ طَآئِفَةً بِأَنَّهُمْ كَانُواْ مُجْرِمِينَ)،"سورة التوبة:65_66".

واتە: ({ولئن سألتهم} ئەگەر لێیان بپرسیت: سەبارەت بە گاڵتە کردن بەخواو ئایەتەکانی و پێغەمبەری خوا: {ليقولن إنما كنا نخوض ونلعب} ئەڵێن: بەڕاستمان نەبووەو، بەڵکو تەنها گاڵتەو گەپمان دەکرد. (قەتادە) دەڵێت: لەو دەمەدا کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) سەرقاڵی خەزای (تەبووك) بوو، چەند سوارێك لە دووڕووەکان بەبەردەمیا تێپەڕین و گوتیان: زۆر سەیرە! ئەم پیاوە

پێی وایە کە کۆشك و قەڵای ڕۆمەکان دەگرێ ؟! های های لەوە! پاشان ئەم قسەیە بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گەیشتەوە، ئەویش بانگی کردن وگوتیان: ئەمە سوێندی بێ بەگاڵتەوە گوتومانە، ئەوسا ئەم ئایەتە هاتە خوارەوەو فەرمووی: {قل أبالله وآياته ورسوله كنتم تستهزؤن} پێیان بڵێ: ئایا گاڵتەتان بەخواو ئایەتەکانی و، بەپێغەمبەرەکەی کردبوو؟ واتە: هەر وتەیکی کوفرو ناشیرین و ناقۆڵا لەدەم دەرچێت، بێگومانە مرۆڤی پێ کافر دەبێت * {لا تعتذروا قد كفرتم بعد إيمانكم} بڵێ: بڕوبیانووی بێجێ مەهێننەوە، چونکە پاش ئەوە باوەڕتان هێنا، کافربوونەوە {إن نعف عن طائفة منكم} ئەر لەبڕێکتان خۆش ببین لەبەر ئەوە کەپەشیمان بوونەوە لەگوتەکەتان {نعذب طائفة بأنهم كانوا مجرمين} ئەوا جەزرەبەی بڕێکیان دەدەین بەهۆی ئەوەی تاوانکاربوون، واتە: بەردەوام بوون لەسەر کوفرو نیفاق).

**هەلوەشێنەرەوەی حەوتەم:** جادووگەرێتی، لەوانەش تێکدانی نێوان ژن و پیاو و ژن و پیاو لەلای یەکتر خوشەویستکردن، جا هەرکەسێك ئەم کاری جادووگەرێتییە بکات یاخود پێی ڕازی بێت ئەوا ئەو کەسە کافرە، بەلگەش وتەی الله تعالى یە کەوا فەرموویەتی: (وَاتَّبَعُواْ مَا تَتْلُواْ الشَّيَاطِينُ عَلَى مُلْكِ سُلَيْمَانَ وَمَا كَفَرَ سُلَيْمَانُ وَلَكِنَّ الشَّيْاطِينَ كَفَرُواْ يُعَلِّمُونَ النَّاسَ السِّحْرَ وَمَا أُنزِلَ عَلَى الْمَلَكَيْنِ بِبَابِلَ هَارُوتَ وَمَارُوتَ وَمَا يُعَلِّمَانِ مِنْ أَحَدٍ حَتَّى يَقُولاَ إِنَّمَا نَحْنُ فِتْنَةٌ فَلاَ تَكْفُرْ فَيَتَعَلَّمُونَ مِنْهُمَا مَا يُفَرِّقُونَ بِهِ بَيْنَ الْمَرْءِ وَزَوْجِهِ وَمَا هُم بِضَآرِّينَ بِهِ مِنْ أَحَدٍ إِلاَّ بِإِذْنِ اللّهِ وَيَتَعَلَّمُونَ مَا يَضُرُّهُمْ وَلاَ يَنفَعُهُمْ وَلَقَدْ عَلِمُواْ لَمَنِ اشْتَرَاهُ مَا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ خَلاَقٍ وَلَبِئْسَ مَا شَرَوْاْ بِهِ أَنفُسَهُمْ لَوْ كَانُواْ يَعْلَمُونَ)،"سورة البقرة:102".
واتە: ({واتبعوا ما تتلوا الشياطين على ملك سليمان} هەندێ لە نەوەکانی (یەعقووب) کەوتنە شوێنی ئەو جادووە کە شەیاتینی لەسەردەمی پاشایەتی و دەسەڵاتی سولەیماندا (عليه السلام) دایان هێناو دەیانخوێند، واتە: کەوتنە شوێنی ئەو فڕوفێڵانەی دەربارەی حکومەتەکەی سولەیمان دەیانکرد {وما كفر سليمان} خۆ ئاشکرایشە کەسولەیمان کافرو جادووگەر نەبوو و ئەویش 'جادووی دانەهێنا' وەك ئەوان دەڵێن {ولكن الشياطين كفروا} بەڵکو شایەتینەکان جادوویان داهێناو کافرو بێ بڕوا بوون و لەسنوور دەرچوون {يعلمون الناس السحر} و خەڵکیشیان

فێری جادوو دەکرد {وما أنزل على الملكين ببابل هاروت وماروت} هەروەها کەوتنە شوێنی ئەو زانیاریی و زانستیەی هاتبوویە سەر ئەو دوو فریشتەیە 'هاروت وماروت' لە 'بابل'ی عێراقدا، {وما يعلمان من أحد حتى يقولا إنما نحن فتنة فلا تكفر} وە لەهەمان کاتدا هەر کەسێکیان فێری جادوو دەکرد لە سەرەتاوە پێیان دەگوت: ئەم کارەی ئێمە تەنها بۆ تاقیکردنەوەو فێر بوونی جیاکردنەوەی (موعجیزە) و(سیحرە) و لەلایەن خواوە نێردراوین، کەوابوو ئاگادار بە! خۆت کافر مەکە و فێری جادوو نەبیت {فيتعلمون منهما ما يفرقون به بين المرء وزوجه} بەڵام هەندێك هەر کۆڵیان نەدا تا لەو دوو فریشتەوە فێری ئەمە بوون کەبتوانن بەسیحر ژن و مێرد لێکبکەنەوە، واتە: مەردمەکە بەگوێی فریشتەکانیان نەکردو، فێری جادوو بوون و پاشان جادو و سیحریان لەیەك دەکردو، جۆرەها کاری ناپەسەندو ناشەرعییان ئەنجام دەدا، هەرچەند {وما هم بضارين به من أحد إلا بإذن الله} بەبڕیاری خوا نەبووبا ئەو جادووگەرانە توانایان نەبوو زیانێك بەهیچ کەسێ بگەیەنن {ويتعلمون ما يضرهم ولا ينفعهم} هەر فێری شتێ ئەبوون کە زیانیان لێ بداو، هیچ قازانج وسوودێکی نەبێ بۆیان {ولقد علموا لمن اشتراه ما له في الآخرة من خلاق} کە ئەوکارە ناپەسەندەشیان ئەکرد، وە نەبێ لەڕووی نەزانینەوە بێت، بەڵکو ئەو (جولەکانە) چاك دەشیانزانی ئەوکەسەی کڕیاری جادووگەریی بێ، لەڕۆژی دواییدا هیچ کەڵك وسوودێکی پێ ناگا و لەبەهرەی خوا بێ بەشە، {ولبئس ماشروا به أنفسهم لوكانوا يعلمون} بەڕاستیی ئەگەر تێگەیشتبان ئەوشتەی کە ئەوان خۆیانیان پێ فرۆشت، دەیانزانی چ کارێکی زۆر خراپ و ناپەسەند بوو).

**هەلوەشێنەرەوەی هەشتەم:** هاوکاریکردن و پشتگیریکردنی هاوبەشداران و یارمەتیدانیان دژی موسلمانان، بەلگەش وتەی الله تعالى یە کەوا فەرموویەتی: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُواْ لاَ تَتَّخِذُواْ الْيَهُودَ وَالنَّصَارَى أَوْلِيَاء بَعْضُهُمْ أَوْلِيَاء بَعْضٍ وَمَن يَتَوَلَّهُم مِّنكُمْ فَإِنَّهُ مِنْهُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ)، "سورة المائدة:51".
واتە: ({يا أيها الذين آمنوا لا تتخذوا اليهود والنصارى أولياء} ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە! موسایی و عیسایی مەکەنە دۆست و پشتیوانتان، واتە: نە یارمەتیان بدەن و، نەداوای یارمەتیشیان لێبکەن، وە بەهیچ جۆرێك (موالات) و

هاوكــاریی و خۆشەویسـتیان نەبــێ بۆیــان {بعضــهم أولیــاء بعـض} چـونكە ئەوانە هەنـدێكیان پشـتیوان و یارمەتیـدەری هەنـدێكیانن و، لەبەر ئێـوەش دەست لەدینـی خۆیـان هەڵنـاگرن و، گشتیشـیان بـۆ ئێـوە دەبـنە یەك دەسـتەو بەسـتەو، لەرۆژی خۆیدا گەلەكۆمەتان لێدەكەن {ومن یتولهم منكم} و هەركەسێكیشتان دۆستایەتییان لەگەڵ بكـاو، بیانكـا بەیارمەتیـدەرو دۆسـتی خـۆی، وە یـان هاوكـاریی و هاوڕێییـان بكـات {فإنــه مــنهم} بــێ شــك ئەوكەســە هەر لەوانەو بەوان دادەنــرێ، ئەگەرچــی بەناسـنامەیش موسـڵمان بێـت {إن الله لا یهـدی القـوم الظـالمین} بێگومـان خـوا هیدایەت و رێنمایی گەلـی نـاهەقء ستەمكار نـاكـات، دیـارە ئەوانە كە دەبـنە دۆست وهاوكـاری جـوولەكەو فەلەو دووڕازیـی، سنووری خـوا دەبەزێـنن و ستەمكارن، خواش هاوكاریی خەڵكانی ئاوا ناكات).

هەڵوەشێنەرەوەی نۆیەم: هەركەسێك باوەڕی وابێت كەوا هەندێك لەكەسـان بۆیـان هەیە دەربچــن و بچــنە دەرەوە لەشــەریعەتی محمــد "صــلی الله علیــه وســلم" هەروەكو چۆن خضر "علیـه السـلام" بـۆی هەبـوو كەوا دەربچێـت لەشـەریعەتی موسا "علیه السلام" ئەوا ئەو كەسە كافرە).

هەڵوەشێنەرەوەی دەیەم: پشـت هەڵكـردن و دووركەوتـنەوە لەدینـی الله تعـالی كە ئیسلامە، خۆی فێر نـاكـات وە كردەوەشـی پێنـاكـات، بەڵگەشمان وتەی الله تعالی یە كەوا فەرمـوویەتی: (وَمَـنْ أَظْلَـمُ مِمَّـن ذُكِّـرَ بِآيَـاتِ رَبِّـهِ ثُـمَّ أَعْـرَضَ عَنْهَـا إِنَّـا مِـنَ الْمُجْرِمِينَ مُنتَقِمُونَ)،"سورة السجدة:22".
واتە: ({ومــن أظلــم ممــن ذكــر بآیــات ربــه} كــێ لەو كەســە ســتەمكار تــرە كە بەئایەتەكانی پەروەردگاری ئامۆژگاریی دەكرێت {ثم أعرض عنها} كەچی رووی ـان لێوەرچەرخێنێت؟ {إنا من المجرمین منتقمون} ئەوانە تاوانبارن، بەڕاستی ئێمەش تۆڵە لە تاوانباران ئەسێنین).

هـیچ جیـاوازییەك لە هەمـوو ئەم هەڵوەشـێنەرەوانە لەنێـوان گاڵتەكـار و كەسـێك بەڕاستی و ئەنقەست بێت و كەسێك بترسێت تەنها كەسی زۆرلێكراو نەبێت .
وە هەمـوو ئەم هەڵوەشێنەرەوانە لەگەورەترینـی ئەوانەن مەترسیدارن و زۆریش لەوانەن كە ڕوودەدەن .

**بۆیە پێویستە لەسەر موسلمان کەوا ئاگاداریان بێت، وە لێیان بترسێت لەوەی کە تووشیان ببێت، پەنادەگرین لەکارێك کە ببێتە هۆی تۆڕەبوونی الله تعالی، وە پەنادەگرین لە الله تعالی لەئێشی سزاکەی .**

# تەنها الله پەرستی سێ جۆره (التوحيد ثلاثة أنواع)

## يەكەم: تەنها الله پەرستی لەپەروەردگارێتی (توحيد الربوبية):

(بريتيه لەوتەوحيدەی كەوا كافران دانيان پێدا دەهێنا لەسەردەمی پێغەمبەردا "صلى الله عليه وسلم" كەچی لەگەل ئەوەشدا پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" جيهاد و قيتالی لەدژيان ئەنجامدا و تەنها بەمەيان نەهاتنە ناو دينی ئيسلامەوە، وە پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" خوێن و ماليانی حەلال كرد و بەڕەوا زانی، كە ئەمەش تەوحيدی الله يە بەكردەوەكانی). بەلگەش وتەی الله تعالی يە كاتێك فەرموويەتی: (قُلْ مَن يَرْزُقُكُم مِّنَ السَّمَاءِ وَالأَرْضِ أَمَّن يَمْلِكُ السَّمْعَ والأَبْصَارَ وَمَن يُخْرِجُ الْحَيَّ مِنَ الْمَيِّتِ وَيُخْرِجُ الْمَيَّتَ مِنَ الْحَيِّ وَمَن يُدَبِّرُ الأَمْرَ فَسَيَقُولُونَ اللّهُ فَقُلْ أَفَلاَ تَتَّقُونَ)،"سورة يونس:31".

واتە: ( {قل من يرزقكم من السماء والأرض} بلێ: كێ لەم ئاسمان و زەوييەدا رزق و رۆزيتان دەداتێ ؟ {أمن يملك السمع والأبصار} كێيە دروستكەرو خاوەنی ئەوگوێ و چاوانەتان؟ {ومن يخرج الحی من الميت} ئەی كێيە زيندوو لەمردوو دەردێنێ ؟ {ويخرج الميت من الحی} و مردوو لە زيندو دەردەكا؟ {ومن يدبر الأمر} وە كێيە زۆر بەوردیی بۆكاروباری ئەم دونيايە نەخشە دەكێشێ؟ {فسيقولون الله} بەزوويی لەوەلامی هەموو ئەمانەدا دەلێن: هەرخوايە هەموو ئەوانە دەكات {فقل أفلا تتقون} بلێ: دەسا بۆ لە خوا خۆ ناپارێزن و ناترسن؟ بەلێ.. (موشريك) ـەكانيش دان بە (ربووبييەت)ی خوای گەورەدا دەنێن، دەزانن بەديهێنەری بوونەوەر بەتێكڕا هەرخوايە، بۆنموونە: لەسوورەتی(43 /9)دا دەفەرموێ: (ولئن سألتهم من خلق السموات والأرض ليقولن خلقهن العزيز العليم) وە لەسوورەتی (87/43)دا دەفەرموێ: (ولئن سألتهم من خلقهم ليقولن الله ...) وە لەسوورەتی (85-84/23)دا دەفەرموێ: (قل لمن الأرض ومن فيها إن كنتم تعلمون سيقولون لله قل أفلا تذكرون) كەچی لەگەڵ ئەوەيشدا هەرشەريك و هاوبەشی بۆ دادەنێن و دان بە (ئولووهيەت)يدا نانێن، بۆيە دەچن لێرەو لەوێ بەرنامەی ئەم وئەو دەخوازن و پەيڕەوی دەكەن و! خۆيان چەواشە كردووە، لەلايەكەوە دەلێن ئەم بوونەوەرە خوای بالادەست بەديهێناوە، كەچی بۆ ژيان و

کاروباری سیاسەت پەیڕەوی لە خەڵکی تر دەکەن!). چەندین ئایەتی تریش لەسەر ئەمە هەن .

## دووەم: تەنها الله پەرستی لەپەرستراویێتی (توحيد الألوهية):

(ئەم جۆرە تەوحیدەیە کەوا بەردەوام ناکۆکی و ململانێی لەسەر هەبووە لەکۆن و لەئێستادا، کە ئەمەش بریتیە لەتەوحیدی الله بەکردەوەی بەندەکانی، وەکو: دوعا و پاڕانەوە، وە نەزرکردن، وە سەربڕین، وە هیوا، وە ئۆمێدبوون، وە ترس، وە پشت پێبەستن، وە حەزکردن بەگەیشتن بەو شتەی کە پێی خۆشە، وە وە ترس لەو شتەی تووشی ببێت، وە گەڕانەوە و پەشیمانبوونەوە، وە هەموو جۆرێك لەو جۆرانەی کە بەلگەیان لەسەر هاتووە لەقورئاندا).

## سێیەم: تەنها الله پەرستی لەخود و ناو و سیفەتەکان (توحيد الذات والأسماء والصفات):

الله تعالى فەرموویەتی: (قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ * اللَّهُ الصَّمَدُ * لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ * وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ)،"سورة الإخلاص:1_2_3_4".

واتە: ({قل هو الله أحد} ئەی موحەممەد! (صلى الله عليه وسلم) بڵێ: ئەو پەروەردگارەی کەمن دەیپەرستم، تاك و تەنیایەو، هاوەڵ و هاوبەشی نیە * {الله الصمد} ئەو خوایە کە ناوی (الله)یە، جێگای هیواو ئومێدەو، بێ نیازیشە، هیچ کەسێکیش - بێ لەو- شای لێبووەمەوەستەی ئەوە نییە گیرو گرفتەکان ببرێنە لای بۆ چارەسەر، هەر ئەوزاتە گەورەیشە، کە دەبێ هەر بۆلای ئەو بگەڕێینەوە * {لم یلد} کەسی لێ نەبووەو، هیچ رۆڵەیەکی نیە - وەك جولەکەو گاورو بتپەرستەکان دەڵێن -، چونکە خوا زۆر بڵوند و پاك و بێخەوش و دوورە لەو جۆرە بیرو بۆچوونانە {ولم یولد} ولە کەسیش نەبووە و بێدایك و بابە، چونکە هەموو شتێکی لەدایك بوو تازەو نوێیە و، خوا نیەو سەرەتایەکی هەیە، خۆ خوایش بێ سەرەتاو (ئەزەل) ییە * {ولم یکن لە کفوا أحد} و هەرگیز هیچ کەسێك هاوشێوەو هاوتای نیە و، کەسێ ناتوانێ بەر هەڵستی بکات).

**وە هەر الله تعالی فەرموویەتی: (وَلِلّهِ الأَسْمَاء الْحُسْنَى فَادْعُوهُ بِهَا وَذَرُواْ الَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِي أَسْمَآئِهِ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ)،"سورة الأعراف:180".**
**واتە: ({وللە الأسماء الحسنى} ناوەکانی خوا هەموو جوان و پڕشکۆن {فادعوه بها} دەسا ئێوەیش هەر بەو ناوانەوە بانگی بکەن، لالەو نزاو داواهەر بەوانە بکەن {وذروا الذين يلحدون فی أسمائه} لەوانەگەڕێن دەس وەردەدەن لەناوەکانی خواو بەدەس ئەنقەست دەیانگۆڕن، واتە: لەماناو مەبەست لایان دەدەن، یان ناوی تری بۆ دادەنێن! بۆنموونە: موشریکەکان لە باتی ئەوە کەناوی (الله) بێنن، دەیانگوت (لات)، یان لە باتی ئەوە بڵێن (عزیز) ئەیانوت: (عزی)..هتد. {سيجزون ما كانوا يعملون} دڵنیابە ئەوانە بە تۆڵەی کردەوەی خۆیان ئەگەن).**

**وە هەر الله تعالی فەرموویەتی: (فَاطِرُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا وَمِنَ الْأَنْعَامِ أَزْوَاجًا يَذْرَؤُكُمْ فِيهِ لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ وَهُوَ السَّمِيعُ البَصِيرُ)، "سورة الشوری:11".**
**واتە: ({فاطر السموات والأرض} بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوییە {جعل لكم من أنفسكم أزواجا} هەر لەخۆشتان هاوسەرو ژنانی بۆ داناون {ومن الأنعام أزواجا} وەلە وشترو گاو مەڕو بزن ، جووتێ نێرو مێی بۆ دروستکردوون {يذرؤكم فيه} زۆرتان دەکا بە زاو زێ {ليس كمثله شئ} هیچ شتێك نیە لەوێنەی ئەو (خوا)یە ،نە لەزاتیا، نە لە سیفاتیا، نەلە کرداریا، بۆ خۆی تەنیایەو، لەهەموو شتێك، بێ نیازەو، هەمو شتێکیش نیازمەندە بەو {وهو السميع البصير} ئەویشە بیسەری بینا، بەئاگایە بە وتەی بەندەکانی، بینایە بۆ کاروکرداریان).**

# دژی تەنها الله پەرستی بریتیە لەهاوبەشدانان بۆ الله تعالی
# (ضد التوحید الشرك)

**هاوبەش دانان بۆ الله تعالی دەبێتە سێ جۆر:**
**هاوبەشدانانی گەورە، هاوبەشدانانی بچووك، هاوبەشدانانی شاراوە و نادیار .**

## جۆری یەکەم لەجۆرەکانی هاوبەشدانان بۆ الله تعالی:

**بریتیە هاوبەشدانانی گەورە بۆ الله تعالی: الله تعالی لەو کەسە خۆش نابێت کەوا شیرکی گەورە ئەنجامدەدات، وە هیچ کاروکردەوەیەکی چاکیشی لێ قبول ناکات بەهۆی ئەم شیرکە گەورەیەوە .**
**الله تعالی کە بەرز و بەرێزە فەرموویەتی: (إِنَّ اللّهَ لاَ يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَلِكَ لِمَن يَشَاء وَمَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلاَلاً بَعِيدًا)،"سورة النساء:116".**
**واتە: ({إن الله لايغفر أن يشرك بە} بێگومـان خـوا لەوانە خـۆش نـابێ هـاوەڵ و هاوەبەشـی بـۆدانێن {ويغفـر مـا دون ذلـك لمـن يشـاء} تـاوانی کەمتـر لەشيرك بـۆ هەرکەسێك خۆی بیەوێ وشایستە بێت ئەبورێ {ومـن يشـرك بـالله فقد ضل ضـلالا بعيـدا} دەسـا بـزانن کە هەرکەسێك شـەريك و هـاوبەش دابنێـت بۆخـوا، بەراسـتيی لەڕادەبەدەر گومڕاو سەرلێشێواوە).**

**وە هەر الله تعالی کە پاك و بێگەردە فەرموویەتی: (لَقَدْ كَفَرَ الَّذِينَ قَالُواْ إِنَّ اللّهَ هُوَ الْمَسِيحُ ابْنُ مَرْيَمَ وَقَالَ الْمَسِيحُ يَا بَنِي إِسْرَائِيلَ اعْبُدُواْ اللّهَ رَبِّي وَرَبَّكُمْ إِنَّهُ مَن يُشْرِكْ بِاللّهِ فَقَدْ حَرَّمَ اللّهُ عَلَيهِ الْجَنَّةَ وَمَأْوَاهُ النَّارُ وَمَا لِلظَّالِمِينَ مِنْ أَنصَارٍ)،"سورة المائدة:72".**
**واتە: ({لقد كفر الذين قالوا إن الله هو المسيح ابن مريم} عیسایییەکان۔ ئەوانەیان دەڵێن: خوا خۆی مەسیحی کوری مەریەمە۔ بێگومان کافرن، چونکە خوا بۆ خۆی تاك و تەنیایەو، (مەسیح)یش هێمان هەر لەبێشکەدا بوو گوتی: (إنی عبد الله آتانی الكتاب و جعلنی نبيا) هەتا ئەوە کە گوتی) :وإن الله ربی وربكم فاعبدوه هذا صراط مستقيم) {وقال المسيح يا بنی إسرائيل} مەسیحیش کـاتێ رەوانە کرا گوتی: ئەی نەوەکانی یەعقووب! {إعبدوا الله ربی و ربكم} دەبێ ئێوە هەر ئەوخوایە بپەرستن**

كە پەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەشە {إنه من يشرك بالله} چاك بزانن كە هەركەسێك شەريك و هاوبەش بۆخوا دابنێ {فقد حرم الله عليه الجنة} بێ شك خوا بەهەشتی لەسەر ياساغ دەكا {و مأواه النار} جێ و شوێنی ئاگرە {وما للظالمين من أنصار} ستەمكارانيش هيچ جۆرە يارمەتی دەرێكيان بۆ نييەو رزگار نابن).

وە هەر الله تعالى فەرموويەتی: (وَقَدِمْنَا إِلَى مَا عَمِلُوا مِنْ عَمَلٍ فَجَعَلْنَاهُ هَبَاء مَّنثُورًا)،"سورة الفرقان:23".
واتە: ({وقَدِمنا إلى ما عملوا من عمل} هاتين هەركارێكيان كردبوو (وەك سەردانی خزم و كەس وكارو هەرچاكەيەكی تر) {فجعلناه هباء منثورا} هەمووي‌مان وەك تۆزو گەردی بڵاوە پێكراوی بەربا پێكرد، واتە: هيچ سوودێكی نەبوو بۆيان).

وە هەر الله تعالى كە پاك و بێگەردە فەرموويەتی: (وَلَقَدْ أُوحِيَ إِلَيْكَ وَإِلَى الَّذِينَ مِنْ قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ الْخَاسِرِينَ)،"سورة الزمر:65".
واتە: ({ولقد أوحى اليك والى الذين من قبلك} سوێند ئەخۆم كە بێگومان وەحی كراوە بۆ تۆ و بۆ ئەو پەيامبەرانەی بەر لە تۆ بوون: {لئن أشركت ليحبطن عملك} كە ئەگەر گريمان بە هاوبەش قايل ببێت بۆ خوا، ئەوە بێگومان هەموو كردەوەكانت پووچەڵ دەبێ {ولتكونن من الخاسرين} و لە زيانمەندانيش دەبيت).

وە هەر الله تعالى كە بەرز و بەڕێزە فەرموويەتی: (ذَلِكَ هُدَى اللّهِ يَهْدِي بِهِ مَن يَشَاء مِنْ عِبَادِهِ وَلَوْ أَشْرَكُواْ لَحَبِطَ عَنْهُم مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ)،"سورة الأنعام:88".
واتە: ({ذلك هدى الله} ئەوەيە رێی راستی خواو، رێنمايش هەربەدەستی خۆيەتی {يهدى من يشاء من عباده} لە بەندەكانی خۆی كێ حەزلێ بكا، شارەزاو رێنمايی گشت كارێكی خێری دەكات {ولو أشركوا} لەگەڵ ئەوەيشدا ئەگەر ئەو پەيامبەرانە (عليه السلام) هاوبەشيان بۆخوا دانابا {لحبط عنهم ما كانوا يعملون} هەموو كارەكانيان سەرجەم پووچەڵ دەبوويەوە, باشە دەبێ حاڵی خەڵكانی تر چۆن بێت, ئەگەر هاوبەش و شەريك بۆخوا دابنێين؟).

وه ئهم هاوهشدانانی گهورهیه بۆ الله تعالی دهبێته چوار جۆر:

یهكهم: هاوبهشدانان بۆ الله تعالی له داوالێكردن و پهرستن و هاوار بۆ كردن، بهڵگهش وتهی الله تعالی یه كهوا فهرموویهتی: (فَإِذَا رَكِبُوا فِي الْفُلْكِ دَعَوُا اللَّهَ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ فَلَمَّا نَجَّاهُمْ إِلَى الْبَرِّ إِذَا هُمْ يُشْرِكُونَ)،"سورة العنكبوت:65".

واته: ({فإذا ركبوا فى الفلك دعوا الله مخلصين له الدين فلما نجاهم إلى البر إذاهم يشركون} لهكاتی خۆشیی و ئاسایشدا دهبینی ئهو خهڵكهیه بێ باوهڕن و نكوڵیی قیامهت دهكهن، كهچی كاتێ سواری كهشتی ئهبن و ترسی نقوم بوونیان لێ دهنیشێت زۆر بهكوڵ سهر دائهنێن و ملكهچیی و یهكلابوونهوهی خۆیان بۆ خوا دهرئهبڕن و تهنها لهو داوا ئهكهن و، باسی بتهكان نامێنێ، بهڵام كاتێ ڕزگاریان دهكاو دهگهنه وشكانیی، دووباره دهچنهوه سهر بیره پووچهڵهكهی خۆیان و بهههمان جۆر شهریك و هاوهڵ بۆ خوا دادهنێن).

دووهم: هاوبهشدانان بۆ الله تعالی له نییهت و ویست و مهبهستدا، بهڵگهش وتهی الله تعالی یه كهوا فهرموویهتی: (مَن كَانَ يُرِيدُ الْحَيَاةَ الدُّنْيَا وَزِينَتَهَا نُوَفِّ إِلَيْهِمْ أَعْمَالَهُمْ فِيهَا وَهُمْ فِيهَا لاَ يُبْخَسُونَ * أُوْلَئِكَ الَّذِينَ لَيْسَ لَهُمْ فِي الآخِرَةِ إِلاَّ النَّارُ وَحَبِطَ مَا صَنَعُواْ فِيهَا وَبَاطِلٌ مَّا كَانُواْ يَعْمَلُونَ)،"سورة هود:15_16".

واته: ({من كان يريد الحياة الدنيا وزينتها} ههركهسێك تهنها ژیانی ئهم دونیایهو جوانیی و زهرق و بهرقی ئهوی بوێ و، پاشهڕۆژ پشتگوێ بخا {نوف إليهم أعمالهم فيها} ئهوا ئێمهش ههر لهم دونیایهدا بهتێروتهسهلی پاداشی گشت ههوڵ و كردهوه چاكهكانیان ـ وهك سهردانی خزمان و..هتد ـ دهدهینهوه، بهتهندروستیی و ئاسوودهیی و رۆزیی و ناوو شۆرهتی دنیا {وهم فيها لا يبخسون} هیچیشیان لێ كهمناكرێتهوه * {أولئك الذين ليس لهم فى الآخرة إلا النار} ئهوانه لهدوا ڕۆژدا ـ جگه لهئاگر ـ هیچ بهش و بههرهیهكیان نییه {وحبط ما صنعوا فيها}و ههر ههوڵ و چاكهیهكیشیان لهدونیادا كردبێ ، گشتی بهفیڕۆو بێهووده دهچێت {و باطل ما كانوا يعملون} و باتڵ و ناحهق و ناڕهوایه ئهوهی كردیان).

سێیهم: هاوبهشدانان بۆ الله تعالی لهگوێڕایهلیكردندا، بهڵگهش وتهی الله تعالی یه كهوا فهرموویهتی: (اتَّخَذُواْ أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَابًا مِّن دُونِ اللّهِ وَالْمَسِيحَ ابْنَ

مَرْيَمَ وَمَا أُمِرُواْ إِلاَّ لِيَعْبُدُواْ إِلَهًا وَاحِدًا لاَّ إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ سُبْحَانَهُ عَمَّا يُشْرِكُونَ)،"سورة التوبة:31".
واته: ({إتخـذوا أحبـارهم ورهبـانهم أربابـا مـن دون الله} لە بـری خـوا مەلاو رەبەنەكـانی خۆيانيـان كـردە خـوا ! واتە: حەراميـان بـۆ حەڵاڵكـردن، وەكـو ئەو فەرموودەيە ـ ترمزی لەعەديەوە ـ لە سەر زاری پەيامبەر (صلى الله عليه وسلم) دەيگێڕێتەوەو دەڵێ: خاچێكم لەملدا بووو چوومە خزمەتی پێغەمبەر، كەمنی ديت ئەم ئايەتەی خوێندەوە: (إتخذوا أحبـارهم ورهبـانهم ..) پاشـان (عەديی) گوتی خۆ ئەوان: سوژدە بۆ مەلا و رەبەنەكانيان نابەن، بەڵكو دەسكاری حەڵاڵ و حەراميـان بۆدەكەن {والمسيح ابن مريم} و فەلەكانيش عيسای كوڕی مەريەميـان كردە خوا! {ومـا أمـروا إلا ليعبـدوا إلهـا واحـدا} خۆ وا فەرمانيشـيان پێدرابوو كە: دەبێ هەر خوای تاك و تەنيا بپەرستن {لا إلة إلا هو} كە جگە لەخۆی هيچ پەرستراوێكی تر بە هەق نيە {سبحانة عما يشركون} خوا لەوشتانە پاك و بێخەوشـە بێ باوەڕەكـان دەيكەنە هاوتاو هاوبەشيی).

وە تەفسيرەكەشـی كەوا هـيچ گومـانێكی تيايـدا نيـيە: گـوێڕايەليكردنی زانايـان و خواپەرسـتان لەسـەرپێچی كردنـی فەرمانەكـانی الله تعـالی دا نەك پـاڕانەوە لێيـان، هەروەكـو پێغەمبـەر "صـلى الله عليـه وسـلم" خـۆی تەفسـيری كـردووە بـۆ عەدی كوڕی حاتـەم "رضي الله عنـه" لەكاتێكدا كە پرسياری لێكرد، حاتەميش لەوەلاميدا فەرمووی: ئەمان دەپەرستن، پێغەمبەريش "صلى الله عليـه وسـلم" بـۆی باسـكرد و فەرمـــووی: پەرســتنيان بـــريتيە لەگوێڕايەليكردنيـــان لەســـەرپێچی كردنـــی فەرمانەكانی الله تعالی دا .

چـوارەم: هاوبەشـدانان بـۆ الله تعـالی لەخوشويسـتندا، بەڵـگەش وتەی الله يە كەوا فەرموويەتی: (وَمِنَ النَّـاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللّهِ أَنـدَاداً يُحِبُّونَـهُمْ كَحُبِّ اللّهِ وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبًّا لِّلّهِ وَلَوْ يَرَى الَّذِينَ ظَلَمُواْ إِذْ يَرَوْنَ الْعَذَابَ أَنَّ الْقُوَّةَ لِلّهِ جَمِيعاً وَأَنَّ اللّهَ شَدِيدُ الْعَذَابِ)،"سورة البقرة:165".
واتە: ({ومـن النـاس مـن يتخـذ مـن دون الله أنـدادا} هەنـدێ لەم خەڵكە هەيە لەگەڵ ئەوەشدا تێنافكرێ تاخوا بەتەنها بپەرستێ ، هێشتا چەند هاوتاو چەنـد هاوبەشێكی

بۆ دادەنێ {يحبونهم كحب الله} خۆشیان دەوێن وەك خۆشەویستی خودا، واتە: ئەوانیش هەر ئەوەندە بت و بەرنامەكانیان خۆش دەوێ {والذين آمنوا أشد حبا لله} ئەوانەش وا باوەڕیان هێناوە، خوایان لەهەموو شتێك زیاتر خۆش دەوێ {ولو يرى الذين ظلموا إذ يرون العذاب أن القوة لله جميعا} ئەوانە وا ستەمیانكردوو هاوبەشیان بۆ خوا دانا، كاتێ ئەو رۆژە سەخت و سزایە دەبینن كەلەقیامەتدا دوو چاریان دەبێ، ئیتر چاك بۆیان دەردەكەوێ و دەزانن: كەهەرچی هێزو توانا هەیە هەرهەمووی بۆ خوایە {وأن الله شديد العذاب} و سزای خواش توندو قورس وسەختە، ئیتر ئەمرۆ لەدنیادا لەو شیرك و سەرلێشێواوییە دەهاتنە دەرێ).

## جۆری دووەم لەجۆرەكانی هاوبەشدانان بۆ الله تعالى:

بریتیە لەهاوبەشدانی بچووك بۆ الله تعالى كە بریتیە لە ڕیاء واتە پێش چاویی، بەلگەش وتەی الله تعالى یە كەوا فەرموویەتی: (قُلْ إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَى إِلَيَّ أَنَّمَا إِلَهُكُمْ إِلَهٌ وَاحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُو لِقَاء رَبِّهِ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَالِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِ أَحَدًا)،"سورة الكهف:110".

واتە: ({قل إنما أنا بشر مثلكم يوحى إلى} پێیان بلێ ئەی پێغەمبەر!صلى الله عليه وسلم منیش تەنها هەر مرۆڤێكم وەك ئێوە، وەحیم بۆ دەكردێ كە: {أنما إلهكم إله واحد} بلێم بەڕاستی تەنیا یەك خواو پەرستراو هەیە، تەنها خواو پەرستراوێكی یەكتایە {فمن كان يرجوا لقاء ربه} ئینجا هەركەسێك لەئێوە ئومێدی بەگەیشتنی دیداری پەروەردگاری خۆی هەبێ لەدوارۆژدا {فليعمل عملا صالحا} با كاری چاك وكردەوەی دروست ئەنجام بدات {ولا يشرك بعبادة ربه أحدا} وە لە پەرستنی پەروەردگاری خۆیدا هیچ كەسێك نەكاتە هاوتاو هاوبەشیی و رووپامایی نەكات، چونكە خوا تەنها دڵسۆزیی وئیخلاس وەرئەگرێ، نەڕییاو رووپامایی وشیرك و هاوبەش دانان. (ولله الحمد والمنة)).

## جۆری سێیەم لەجۆرەكانی هاوبەشدانان بۆ الله تعالى: بریتیە لەهاوبەشدانانی شاراوە و نادیار بۆ الله تعالى،

بەلگەش لەسەری فەرموودەی پێغەمبەرە "صلى الله عليه وسلم) كەوا فەرموویەتی: (الشرك في هذه الأمة أخفى من دبيب النملة

**السوداء في ظلمة الليل)، واته: (هاوبەشدانان بۆ الله تعالى لەناو ئەم ئوممەتەدا شاراوەترە لەشوێنی ڕۆیشتنی مێرووولەی ڕەش لەسەر بەردی ڕەش لەتاریکی شەودا). وە کەفارەتەکەشی فەرمووودەی پێغەمبەری خوایە کەوا فەرموویەتی: (اللهم إني أعوذ بك أن أشرك بك شيئا و أنا أعلم، وأستغفرك من الذنب الذي لا أعلم)، واته: (ئەی پەروەردگار پەنات پێ دەگرم لەوەی هاوبەشت بۆ دابنێم کە دەزانم ئەوە هاوبەشدانانە، وە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم لەو تاوانانەی کەوا دەیکەم و نازانم).**

# بێباوەڕی دوو جۆرە (الكفر الكفران)

**جۆری یەكەمی بێباوەڕی:** بریتیە بێباوەڕییەك كەوا موسلمان دەردەكات لەدینی ئیسلام: ئەویش دەبێتە پێنج جۆر:

**جۆری یەكەم: بێباوەڕی بەدرۆخستنەوە:** بەلگەش وتەی الله تعالى یە كەوا فەرموویەتی: (وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَى عَلَى اللَّهِ كَذِبًا أَوْ كَذَّبَ بِالْحَقِّ لَمَّا جَاءهُ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْكَافِرِينَ)،"سورة العنكبوت:68".
واتە: ({ومن أظلم ممن افترى على الله كذبا} كێ لەو كەسە ستەمكارترە كە لە سەر خوا درۆ هەڵبەسێ و هاوبەش و هاوەڵی بۆ دادەنێ؟ {أو كذب بالحق لما جاءه} یان باوەڕی بەو قورئانە هەقە نەبێت كاتێ بۆی هات؟ {أليس فى جهنم مثوى للكافرين} ئاخۆ بۆ بێ بڕوایان لە دۆزەخدا جێ نیە؟! واتە: جێ هەیە لە دۆزەخدا بۆیان).

**جۆری دووەم: بێباوەڕی گوێ پێنەدان و لووت بەرزی و خۆبەگەورەدانان لەگەل بەڕاستدانانی:** بەلگەش وتەی الله تعالى یە كەوا فەرموویەتی: (وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلاَئِكَةِ اسْجُدُواْ لآدَمَ فَسَجَدُواْ إِلاَّ إِبْلِيسَ أَبَى وَاسْتَكْبَرَ وَكَانَ مِنَ الْكَافِرِينَ)،"سورة البقرة:34".
واتە: ({وإ ذقلنا للملائكة اسجدوا لآدم} ئەی پێغەمبەر! ئەوەدەمەیان وەبیر بێنە كەئێمە بەفریشتەكانمان گوت: سوژدەو كڕنووش بەرنە بەرئادەم {فسجدوا إلا إبليس} ئینجا ئەوانیش دەست بەجێ كڕنووشیان برد ، شەیتان نەبێت {أبى واستكبر} ئەو سەرپێچیكردو خۆی بەزلزانیی {وكان من الكافرين} و بوو بەیەكێ لەبێ باوەڕان).

**جۆری سێیەم: بێباوەڕی دوودلی، كە بریتیە لەبێباوەڕی گومانبردن:** بەلگەش وتەی الله تعالى یە كەوا فەرموویەتی: (وَدَخَلَ جَنَّتَهُ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِ قَالَ مَا أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَذِهِ أَبَدًا * وَمَا أَظُنُّ السَّاعَةَ قَائِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَى رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا * قَالَ لَهُ صَاحِبُهُ وَهُوَ يُحَاوِرُهُ أَكَفَرْتَ بِالَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّاكَ رَجُلًا * لَّكِنَّا هُوَ اللَّهُ رَبِّي وَلَا أُشْرِكُ بِرَبِّي أَحَدًا)،"سورة الكهف:35_36_37_38".

واتە: ({ودخل جنته وهو ظالم لنفسه} رۆژێك بەكەش و فشێكەوە دەستیی هاوڕێ موسڵمانەكەی گرتوو و رۆیشتە ناو باخەكەیەوەو، خۆی بەشتێكی سەیرهاتە پێش چاو {قال ما أظن أن تبيد هذه أبدا} بە لووتێكی بەرزەوە گوتی: هەرگیز باوەڕ ناكەم ئەم باخ و باخاتەم تیا بچێت * {وما أظن الساعة قائمة} باوەڕ ناكەم قیامەتیش هەرگیز بەرپا ببێت {ولئن رددت إلى ربى لأجدن خيرا منها منقلبا} خۆئەگەر هەر برایشمەوە بۆلای پەروەردگارم و قیامەتیش ڕاست بوو هات، ودوای مردنیش زیندوو كرامەوە ـ وەكو تۆ دەڵێیت ـ دڵنیام كە لەوێش جێگایەكی چاكترو باخ و باخاتێكی رازاوەترم دەست دەكەوێ، چونكە شان و شەوكەتی خۆم ئەوە هەڵدەگرێت * ئیمانداره نەدارەكە بە ئاخافتن هات: {قال له صاحبه وهو يحاوره} هاوەڵە ئیماندارەكەیش پێیگوت: {أكفرت بالذى خلقك من تراب} ئەرێ كافرو بێ باوەڕ بووی بەو خوایە كە لەبنەچەی تۆی لەگڵ دروستكرد؟ {ثم من نطفة} پاشان لەتنۆكە ئاوێكی قێزەون {ثم سواك رجلا} ئەوجا قۆناغ بەقۆناغ كردیتی بەپیاوێكی تەواوو، ئێستایش یاخیی بوویت؟! * {لكنا هو الله ربى} بەڵام ـ چاك بزانە- كەمن پێ لێ دەنێم و دەڵێم: كە هەر ئەو (الله) یە پەروەردگار و بەدیهێنەرم {ولا أشرك بربى أحدا} و هیچ كەسیش ناكەمە هاوتا و هاوبەشی پەروەردگارم).

جۆری چوارەم: بێباوەڕی پشت هەلكردن: بەلگەش وتەی الله تعالى یە كەوا فەرموویەتی: (مَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى وَالَّذِينَ كَفَرُوا عَمَّا أُنذِرُوا مُعْرِضُونَ)،"سورة الأحقاف:3".

واتە: ({ما خلقنا السموات والأرض وما بينهما إلا بالحق وأجل مسمى}، ئاسمانەكان و زەویی و ئەوەی نێوانیان، بە دادگەری و بەتەقدیری ماوەیەكی دیاریكراو نەبێ، دروستمان نە كردوون، ئیتر پاش ئەو مەودایە دواییان دێ و، ئێوەیش دێنەوە بەردەست خۆم {والذين كفروا عما أنذروا معرضون} ئەوانەی بڕوایان نەهێناوە ڕوو وەر ئەگێڕن لەوەی پێی ترسێنراون لە دروستكردنەوەیەكی نوێ بۆ جەزا!).

**جـۆری پێـنجەم: بێبـاوەڕی دووڕوویـی:** بەڵـگەش وتەی الله تعـالی یە کەوا فەرمـوویەتی : (ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ آمَنُوا ثُمَّ كَفَرُوا فَطُبِعَ عَلَى قُلُوبِهِمْ فَهُمْ لَا يَفْقَهُونَ)، "سورة المنافقون:3".

واتە: ({ذلك بأنهم آمنوا ثم كفروا} ئەو بەدکاریەشیان هی ئەوەبوو کە بۆ یەکەمجار باوەڕیان هێنا، پاشان کافر بوونەوە! {فطبع على قلوبهم} ئیتر مۆری بەدبەختی نرا بەسەردڵیاندا {فهم لا يفقهون} جا ئەوان تێناگەن وحەقیقەت وەرناگرن و وشەو مانای خێر نازانن، واتە: چاك و خراپ لەیەك ناكەنەوە).

**جۆری دووەم لەجۆرەکانی بێباوەڕی:** بریتیە لە بێباوەڕی بچووك، ئەویش ئەو جۆرە بێباوەڕیەیە کەوا ئەنجامدەرەکەی لەدینی ئیسلام دەرناکات، ئەویش بێباوەڕی بەخشش و خۆشگوزەرانییە: بەڵگەش وتەی الله تعالی یە کەوا فەرموویەتی: (وَضَرَبَ اللّهُ مَثَلاً قَرْيَةً كَانَتْ آمِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ اللّهِ فَأَذَاقَهَا اللّهُ لِبَاسَ الْجُوعِ وَالْخَوْفِ بِمَا كَانُواْ يَصْنَعُونَ)، "سورة النحل:112".

واتە: ({وضرب الله مثلا قرية} خوا مەسەل و نموونەی خۆشگوزەرانی و ئاوەدانیی شاری (مەککە) دێنێتەوە {كانت آمنة مطمئنة} کە ژیانیان پڕ بوو لە ئاسوودەیی و ئارامش, کەچی لەملاو لەولای ئەوانیشەوە خەڵك تاڵاندەکراو دەڕفێنران , پاشان کە پەیامبەریان (صلى الله عليه وسلم) بۆ هات و, لەباتی شوکرانە بژێریی، پشتیان تێکردو دڵیان ئێشان، ئینجا خوای باڵادەست جۆراو جۆر جەزرەبەی دان و لێی تێکدان {يأتيها رزقها رغدا من كل مكان} لەهەمووولایەکەوە ڕزق و ڕۆزیی و نیعمەتی زۆریان بۆ دەهات {فكفرت بأنعم الله} کەچی لەباتی شوکرانە بژێریی لەبەرامبەر ئەو هەموو گشت چاکەوە ناسوپاسی نیعمەتەکانی خوایانکردو، باوەڕیان بەپێغەمبەرەکەی نەکردو چوون بەگژیا {فأذاقها الله لباس الجوع والخوف بما كانوا يصنعون} جا خوایش جل و بەرگی برسیەتی و ترسی لەبەرکردن و تاڵاوی پێچەژین).

# جۆرەکانی دووڕوویی (أنواع النفاق)

**دووڕوویی دوو جۆرە: دووڕوویی بیروباوەڕی و دووڕوویی کرداری**

**جۆری یەکەم دووڕوویی بیروباوەڕی: ئەمەش جۆرە کە خاوەنەکەی لەچینی خوارەوەی ئاگردایە:**

**یەکەم: بەدرۆخستنەوەی پێغەمبەر "صلى الله عليه سلم".**
**دووەم: بەدرۆخستنەوەی بەشێك لەوەی کەوا پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" هێناویەتی .**
**سێیەم: ڕق لێبوونەوە لەپێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم".**
**چوارەم: ڕق لێبوونەوە لەبەشێك لەوەی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" هێناویەتی .**
**پێنجەم: دلخۆشبوون بەنزمبوونەوە و شکستی دینی پێغەمبەر "صلى الله عليه سلم".**
**شەشەم: دلتەنگبوون و پێناخۆشبوون بەسەرکەوتنی دینی پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم".**

**جۆری دووەم دووڕوویی کرداری: ئەم جۆرەیان دەبێتە پێنج جۆر: بەلگەش فەرموودەی پێغەمبەرە "صلى الله عليه وسلم" کەوا فەرموویەتی: (آية المنافق ثلاثة: إذا حدث كذب، وإذا وعد أخلف، إذا أئتمن خان)، واتە: (نیشانەی دووڕوویی سێ دانەیە: ئەگەر قسەی کرد ئەوا درۆ دەکات، وە ئەگەر بەلێنیدا سەرپێچی بەلێنەکەی دەکات، وە ئەگەر ڕاسپاردەیەکی لەلا دانرا ئەوا خیانەتی لێ دەکات).**

**وە هەر پێغەمبەر "صلى الله عليه وسلم" لەگێرانەوەیەکی تردا فەرموویەتی: (وإذا خاصم فجر، وإذا عاهد غدر)، واتە: (وە ئەگەر ناکۆکییەکی هەبێت تاوانی تێدا دەکات، وە ئەگەر پەیمانیدا ئەوا پەیمانەکەی دەشکێنێت و هەلیدەوەشێنێتەوە).**

# واتای طاغوت و سەرەکیترینی جۆرەکانی
# (معنى الطاغوت ورؤوس أنواعه)

بزانە ڕەحمەتی الله تعالى لە تۆ بێت یەکەمین شت کە الله تعالى لەسەر نەوەکانی ئادەمی پێویستکرد بریتیبوو لە کوفرکردن بەطاغوت و ئیمان هێنان بە الله، بەلگەش وتەی الله یە کاتێك کەوا فەرموویەتی: (وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولاً أَنِ اعْبُدُواْ اللّهَ وَاجْتَنِبُواْ الطَّاغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى اللّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلالَةُ فَسِيرُواْ فِي الأَرْضِ فَانظُرُواْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ)،"سورة النحل :36".

واتە: ({ولقد بعثنا في كل امة رسولا} بەراستی بۆناو هەموو ئوممەت و نەتەوەیەك لەهەموو سەردەمێکدا پەیامبەرێکمان ناردووە {أن اعبدوا الله واجتنبوا الطاغوت} بۆ ئەوە پێیان بڵێ: تەنها خوا بپەرستن و، لە (تاغووت) و یاسا پوچەڵەکان دووربن. بەڵێ ئەو دووخاڵە: (خوا پەرستن و، وەلانانی تاغووت) کەهەر پێغەمبەرەی داویەتی بەگوێی ئوممەتەکەی خۆیدا ئەساس و بناغەی گشت ئایینەکان و دینی ئیسلامیشە ، لەجێگایەکی تردا دەفەرموێ: (وما أرسلنا من قبلك من رسول إلا نوحى إلية أنة لاإلة إلاأنا فاعبدون ). {فمنهم من هدي الله} بازێکیان خوای دلۆڤان خۆی رێی نیشاندان، چونکە ئامادەو شیاو بوون {ومنهم من حقت عليه الضلالة} هی وایشیان هەبوو بەهۆی لاساری خۆیانەوە لاڕێی و گومڕایی بۆ بڕایەوە {فسيروا في الأرض} جا ئادەی بەسەر زەوییدا بچن و بگەڕێن {فانظروا كيف كان عاقبة المكذبين} و ببینن و بنواڕن چارەنووسی ئەوانەی کە بڕوایان نەهێناو، پەیامبەرەکانیان بە درۆزن دانا چۆن بووە؟ لەجێگایەکی دیکەدا دەفەرموێ: (دمر الله عليهم وللكافرين أمثالها) یان دەفەرموێ: (ولقد كذب الذين من قبلهم فكيف كان نكير)).

وە لەچۆنییەتی کوفرکردن بەطاغوت: باوەڕت وابێت بەپوچەل "باطل" ی هەرچی پەرستراوە بێجگە لە الله، وە وازلێهێنانیان، وە ڕق لێبونەوەیان و بەکافردانانی ئەو کەسەی کە عیبادەتان بۆ دەکات "واتە ئەوانەی کە عیبادەت بۆ طاغوتەکان دەکەن"، وە دوژمنایەتی کردنیان .

**وە واتای ئیمان هێنان بە الله:** باوەڕت وابێت کە تەنها الله تعالی تاکە پەرستراوە، وە وازبهێنیت لەهەرچی جگە لەوە 'جگە لە الله'، وە دلسۆزی بنوێنی لەئەنجامدانی هەموو جۆرەکانی پەرستندا بۆی "بۆ الله"، وە وازبهێنیت لەهەموو پەرستراوەکانی جگە لەوە 'جگە لە الله'، وە خوشویستنی ئەهلی ئیخلاص 'دلسۆزی و تەوحید' و دۆستایەتیکردنیان، وە ڕق لێبونەوە لەئەهلی شیرك و دوژمنایەتی کردنیان .

ئەمە میللەتی ئیبراهیمە علیه السلام کە هەرکەسێك خۆی دووربخاتەوە لەشوێنکەوتنی ئەوا گێل و نەزانە، وە ئەمەش ئەو سەرمەشقەیە کە الله تعالی خەبەری لێ داوە و باسی کردووە کەوا فەرموویەتی: (قَدْ كَانَتْ لَكُمْ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ فِي إِبْرَاهِيمَ وَالَّذِينَ مَعَهُ إِذْ قَالُوا لِقَوْمِهِمْ إِنَّا بُرَاء مِنكُمْ وَمِمَّا تَعْبُدُونَ مِن دُونِ اللَّهِ كَفَرْنَا بِكُمْ وَبَدَا بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةُ وَالْبَغْضَاء أَبَدًا حَتَّى تُؤْمِنُوا بِاللَّهِ وَحْدَهُ إِلَّا قَوْلَ إِبْرَاهِيمَ لِأَبِيهِ لَأَسْتَغْفِرَنَّ لَكَ وَمَا أَمْلِكُ لَكَ مِنَ اللَّهِ مِن شَيْءٍ رَّبَّنَا عَلَيْكَ تَوَكَّلْنَا وَإِلَيْكَ أَنَبْنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ)،"سورة الممتحنة:4".

واتە: ( {قد كانت لكم أسوة حسنة في إبراهيم والذين معه} بە راستی بۆ ئێوە هەیە ئەی ئیمانداران! لە ئیبراهیم و لەوانەی بڕوایان هێنابوو لەگەڵیا، سەرمەشقییەکی چاك و جوان. جا دەبێ ئێوەیش (ئەی بڕوادارەکان!) لەوان چاو بکەن و خۆتان لەبتەکان و لەو خزمە داروو بەردپەرستانە بەدوور بگرن و تەنها خواتان خۆش بوێ {إذ قالوا لقومهم إنا برءؤا منكم ومما تعبدون من دون الله} کاتێ بەقەومە کافرەکەیانیان وت: بەڕاستی ئێمە بێزارو بەریین لەخۆتان و لەو بتانە- لەجیاتی خوا- ئەیانپەرستن {كفرنا بكم} و بێباوەڕین پێتان {وبدا بيننا وبينكم العداوة والبغضاء أبدا} وە بە هەمیشە دوژمنایەتیی و ڕکەبەرایەتیی لەنێوانماندا پەیدابووە {حتى تؤمنوا بالله وحده} تا باوەڕ بەخوای تاك و تەنیا دێنن و هاوبەشی بۆ دانانێن {إلا قول إبراهيم لأبيه لأستغفرن لك} لەوانەدا چاو لە ئیبراهیم بکەن، ئەو وتەیەی نەبێ کە بە باوکی خۆی گوت: داوای لێخۆشبوونت بۆ دەکەم لە خوا، ئەو بەڵێنەشی هەر لەبەر ئەوەبوو کە پێشتر هیواو ئومێدێکی هەبوو بڕوا بێنێ، بەڵام کە دەرکەوت بێ باوەڕوو دوژمنی خوایە، یەخەی لێهەڵتەکان و بێزاری خۆی

دەربڕی، وەك لەسوورەتێکی تردا ئەمەی ڕاگەیاندووەو دەفەرمووێ: ( وما كان استغفار أبراهيم لأبيه إلا عن موعدة وعدها إياه فلما تبين له أنه عدو لله تبرأ منه ) 9/114 {وما أملك لك من الله من شئ} ئەگەرچی من دەسەڵاتی هیچ شتێکیشم بۆت نیە لای خوا {ربنا عليك توكلنا} ئەی پەروەردگاری ئێمە! هەربە تۆ پشتمان بەستووە {وإليك أنبنا} هەربۆ لای خۆیشت گەڕاینەوە {وإليك المصير} وسەر ئەنجامیش هەر بۆلای تۆیە، واتە: وا ئێمە بەتەواویی خۆمانمان دایە دەستی تۆ، پەنا هەرپەنای تۆیە، دەستمان لەخزم و کەس و کارمان هەڵگرت لەبەرخاتری تۆ، دەسا تۆیش چاودێرمان بە. جا کەوابوو ئەی موسڵمانان! ئەبێ ئێوەیش خۆتان یەکلابکەنەوە، هاوکاریی و تێکەڵییان مەکەن، نهێنیی و ڕازو نیازی موسڵمانانیان بۆمەنێرن بەنامەو بەهەرشتێکی تر).

وە طاغوت گشتییە، بریتیە لە (هەموو شتێك کە بپەرسترێ بێجگە لە الله تعالى وە 'ەو شتەی کەدەپەرسترێ بێجگە لە الله تعالى ڕازیش بێت بەئەنجامدانی ئەو پەرستنە بۆی، جا ئەو پەرستنە لەشێوەی بەندایەتیکردندا یان شوێنکەوتندا یان گوێڕایەلیکردندا بێت کە پێچەوانەی گوێڕایەلی کردنی الله و پێغەمبەرەکەی بن "صلى الله عليه وسلم" ئەوا ئەو شتە طاغوتە) .

وە طاغوتەکان زۆرن وە سەرەکیترینیان پێنجن:

یەکەم: شیطان کە بانگەشەکارە بۆ پەرستنی بێجگە لە الله: بەلگەش وتەی الله تعالى یە کەوا فەرموویەتی: (أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَن لَّا تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ)،"سورة يس:60".

واتە: ({ألم أعهد إليكم يا بني آدم} ئەی نەوەکانی ئادەم ئاخر من پێشتر وەسیەتم بۆ نەکردن {أن لا تعبدوا الشيطان إنه لكم عدو مبين} کە شەیتان نەپەرستن، چونکە ئەو بۆ ئێوە دوژمنێکی ئاشکرایە).

دووەم: ئەو حاکمە "سەرکردە" ستەمکارەی کە حوکمی الله دەگۆڕێت: بەلگەش وتەی الله تعالى یە کەوا فەرموویەتی: (أَلَمْ تَرَ إِلَى الَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ آمَنُواْ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَا أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُواْ إِلَى الطَّاغُوتِ وَقَدْ أُمِرُواْ أَن يَكْفُرُواْ بِهِ وَيُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلاَلاً بَعِيدًا)،"سورة النساء:60".

واته: ({ألم تر إلى الذين يزعمون أنهم آمنوا بما أنزل إليك} ئەرێ ئەوانەت نەدیوە وا دەڵێن باوەڕیان بەو بەرنامەو قورئانەیە دابەزێنراوە بۆت هەیە {وما أنزل من قبلك} و بەوپەیامەش پێش تۆ دابەزێنراوە باوەڕ دەکەن {يريدون أن يتحاكموا إلى الطاغوت} دەیانەوێ بۆ بڕینەوەی داواو کێشەکانیان بچنە لای تاغووت و بەرنامە شەیتانییەکان؟! {وقد أمروا أن يكفروا به} لەکاتێکدا فەرمانیان پێدرابوو بەوبەرنامە شەیتانیانە باوەڕ نەکەن و کارنەکەن {ويريد الشيطان أن يضلهم ضلالا بعيدا} و شەیتانیش دەیەوێ گومڕایان بکات بەگومڕا کردنێکی یەکجار دوور و بێ سنوور).

**سێیەم: ئەو کەسەی کە حوکم و فەرمانڕەوایی دەکات بەجگە لەوەی الله تعالى دایبەزاندووە:** بەڵگەش وتەی الله تعالى یە کەوا فەرموویەتی: (إِنَّا أَنزَلْنَا التَّوْرَاةَ فِيهَا هُدًى وَنُورٌ يَحْكُمُ بِهَا النَّبِيُّونَ الَّذِينَ أَسْلَمُواْ لِلَّذِينَ هَادُواْ وَالرَّبَّانِيُّونَ وَالأَحْبَارُ بِمَا اسْتُحْفِظُواْ مِن كِتَابِ اللّهِ وَكَانُواْ عَلَيْهِ شُهَدَاء فَلاَ تَخْشَوُاْ النَّاسَ وَاخْشَوْنِ وَلاَ تَشْتَرُواْ بِآيَاتِي ثَمَنًا قَلِيلاً وَمَن لَّمْ يَحْكُم بِمَا أَنزَلَ اللّهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْكَافِرُونَ)، "سورة المائدة:44".

واته: ({إنا أنزلنا التوراة فيها هدى و نور} ئێمە تەوراتمان ناردە خوارێ، بێ شك بۆ هەموو خێرو چاکەیەك، ڕێنمایی و ڕووناکایی تێدایە {يحكم بها النبيون الذين أسلموا للذين هادوا} هەموو ئەو پەیامبەرانەی (بەنی ئیسرائیل) - کە بەرفەرمان و ملکەچی بڕیاری خوابوون - هەر بەو تەوراتە داوەریی مووساییەکانیان دەکرد، واته: ئێستا جوولەکە لەرێی ڕاست لایانداوە {والربانيون و الأحبار} و زانا خواناس و شەرع زانەکانیشیان هەروا {بما استحفظوا من كتاب الله} و ئەوانەش کە پارێزگاری تەوراتیان پێ سپێررا بوو پاش ئەوەی یەکەم کەنەهێڵن تێکەو لێکە بکرێ {وكانوا عليه شهداء} و شایەتیش بوون لەسەری ودەیانزانی ڕاست و هەقە، نەك وەکو ئێوە ئەی یەهوودی سەردەم! کە تەوراتتان گۆڕی و حوکمتان پێنەکرد! {فلا تخشوا الناس واخشون} کەوابوو لەمەردم مەترسن، بەڵکو دەبێ تەنها لەمن بترسن و، بەرفەرمانم بن {ولا تشتروا بآياتى ثمنا قليلا} ئایەت و نیشانەکانی من بەبەهایەکی زۆر کەم مەفرۆشن، هەق مەشارنەوە و کیتمانی

مەكەن، خوا چۆن فەرمان دەدا، ملڕاكێشن و تەسليم بن {ومن لم يحكم بما أنزل الله فأولئك هم الكافرون} هەركەسێك بەو كتێب وبەرنامە خوا ناردوويەتی حوكم و بڕيار نەدات، ئيتر لەبەرئەوە بێ كە بەكەم و كورتيی بزانێ، يان هەر بڕوای پێ نەبێ، وە يان لەبەر هەر هۆيەكی تربێ، دیارە هەركەسێكی وا لەو كافرو بێ باوەڕانە لەچوارچێوەی دينی خوا دەچێتە دەرێ).

**چوارەم: ئەو كەسەی كە بانگەشەی زانينی غەيب و ناديارەكان و پەنهانەكان دەكات بێجگە لە الله: بەلگەش وتەی الله تعالی يە كەوا فەرموويەتی: (عَالِمُ الْغَيْبِ فَلَا يُظْهِرُ عَلَى غَيْبِهِ أَحَدًا * إِلَّا مَنِ ارْتَضَى مِن رَّسُولٍ فَإِنَّهُ يَسْلُكُ مِن بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِ رَصَدًا)،"سورة الجن:26_27".**

واتە: ({عالم الغيب فلا يظهر على غيبه أحدا} ئەو زاتە زانای ناديارو غەيبە، غەيبی خۆی بۆ هيچ كەسێك دەرناخاو ئاشكرا ناكا * {إلا من ارتضى من رسول} مەگەر بۆ پەيامبەرێك كە خۆی لێی رازی بێت، ئەوحەلە ئاگاداری هەندێ لەنهێنيەكانی خۆی دەكات، كەوابوو غەيب زانين، تايبەتە تەنها بەزاتی پەروەردگارمانەوە (جل جلاله) ئيتر هيچ كەسێك پەی پێ نابات، مەگەر كەسێكی خاوەن خووی جوان و شيرين و ڕاسال و ملكەچ بۆ فەرمانەكانی خوا لەپەيامبەران، وەك (عيسا)ی كوڕی (مەريەم) ئەوەبوو ئوممەت و گەلەكەی خۆی بەگەلێ شت ـ كە ئەوان نەيان ئەزانی- ئاگادار كرد: (وأنبئكم بما تأكلون وما تدخرون في بيوتكم ..) 49/3.. {فإنه يسلك من بين يديه ومن خلفه رصدا} جا بێگومان ئەوكاتە پەروەردگارت فريشتە دەكاتە پاسەوانی لەپێش و لە پشتيەوە بۆ پاراستنی لەدەستی شياتين و دزينی بۆ جووكيەكان).

**پێنجەم: ئەو كەسەی كە دەپەرسترێت بێجگە لە الله و ڕازيشە بەو پەرستنەی كە بۆی دەكرێت: بەلگەش وتەی الله تعالی يە كەوا فەرموويەتی: (وَمَن يَقُلْ مِنْهُمْ إِنِّي إِلَهٌ مِّن دُونِهِ فَذَلِكَ نَجْزِيهِ جَهَنَّمَ كَذَلِكَ نَجْزِي الظَّالِمِينَ)،"سورة الأنبياء:29".**

واتە: ({ومن يقل منهم إنی إله من دونه} هەركەسێك لەوان غەررابێ و بلێ: منيش خوايەكم جگە لەو، {فذلك نجزيه جهنم} ئەوە پاداشتی بە دۆزەخ ئەدەينەوە {كذلك نجزی الظالمين} هەر ئاوايش تۆڵە و پاداشتی ياخييان و ستەمكاران ئەدەينەوە).

بزانە کەمرۆڤ نابێتە بڕوادار تاکو کوفر بەطاغوت نەکات، بەڵگەش بۆ ئەمە وتەی الله تعالى یە کەوا فەرموویەتی: (لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ قَد تَّبَيَّنَ الرُّشْدُ مِنَ الْغَيِّ فَمَنْ يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىَ لاَ انفِصَامَ لَهَا وَاللّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ)،"سورة البقرة:256".

واتە: (لەئیسلامدا خۆسەپان نیە: {لا إكراه فى الدين} لەم دینی ئیسلامەدا داسەپاندن و ناچارکردن و زەبرو زەنگ نیە بۆدینداریی و وەرگرتنی ئایینی ئیسلام، بەڵێ حوکمی ئەم ئایەتە تەنها خاوەن کتێب و خاوەن نامەکان ئەگرێتەوەو، مەنسوخ و سڕاوەیش نییە، واتە: هەر جوولەکە وگاور سەر ناخرێتە سەریان بۆ ئیسلامبوون. {قد تبين الرشد من الغى} چونکە بێگومانە کەرێگای چاك و راست لە رێگای ناڕاست و کوفرو توولە رێگاکان لێك جیاکراوەتەوە و ئاشکراو نمایانە، جا لەبەر ئەوە نایەوێ زۆر لە هیچ کەسێك بکرێت بۆ ئیسلامبوون و هەر کەسەش بەمەیلی خۆیەتی {فمن يكفر بالطاغوت} ئینجا هەرکەسێك باوەڕی بە 'تاغوت' نەبێت، دیارە تاغووت ئەو کەسەیە کە لە سنووری خوا دەرچێ و، بەرنامە چەوتەکان قبووڵ کا، جا هەرکەس خۆی لەو جۆرە شتانە دوورگرت {ويؤمن بالله} و باوەڕی بەخوا هێنا {فقد اسمتسك بالعروة الوثقى} ئەوە بێگومانە دەستی بە هەنگڵ و بەهۆکارێکی پتەوو قایمەوە گرتووە {لا انفصام لها} کە هەرگیز هەڵناوەشێت و پسان و پچڕانیشی بۆنییە {والله سميع عليم} وە خوای گەورەیش ژنەواو زانایە. زاناکان دەڵێن: (مەجوس) و (سوببی) یەکانیش، لەمەدا حوکمی جوولوکەو گاوریان هەیە، واتە: ئەمانیش هیچ جۆرە زۆرێکیان لێناکرێ بۆ وەرگرتنی دینی ئیسلام، بەڵکو هەر لەسەردینی خۆیان' ئەگەرپێیان خۆش بوو' دەمێننەوەو، سەرانەیان لێ ئەسەنرێ، بەڵام خەڵکانی تری بتپەرست و هاوەبەشدانەرو هەرجۆرە بێ دینێکی تر لەو بابەتە ' هەتا ئەو رۆژە باوەڕ دێنن' دەبێ جەنگیان لەگەڵ بکرێ ئەگەر توانراو بەرژەوەندی تێدابوو. هەموو یاساو دەستورێکی ئیسلامی پیرۆز راست و هەقە، ئیتر بێجگە لەو، گشت دەستورو بەرنامەیەکی تر ناراست وگومڕاییە. دەبێ پێش ئیمان و باوەرهێنان بەخوای گەورە، دەبێ بەتەواویی لەگشت تاغووتەکانەوە دوور بکەوی ، خۆدیارە واتای (لا الـه إلا الله) یش بۆیەکەمجار نەفیی و لادانی هەموو دەسەڵاتدارە ملهوورەکان وتاغوتەکانی دنیایەو، پاشانیش تەسلیم بوون و باوەرهێنانە بەخوای تاك وتەنیا،

شیاوی باسیشە لەسەردەمی جاهیلیەتدا هەر ئەو بتەی وا دەیان پەرست پێیان دەگووت: (طاغیة)، بۆپشتگیری ئەم قسەیە ئەم فەرمووده هاتووه: (کانوا یهلون لمناه الطاغیة)).

الرُّشْدُ "ڕێنمووی و شارەزایی": بریتیە لە دینی محمد صلی الله علیه وسلم کە ئیسلامە .
الْغَيِّ "گومڕایی": بریتیە لە دینی أبي جهل .
الْعُرْوَةِ الْوُثْقَى "پەتی پتەو": بریتیە لە "شهادة أن لا إله إلا الله" واتە: شایەتیدان بەوەی کە هیچ پەرستراوێك نییە بەحەق شایەنی پەرستن بێت تەنها الله نەبێت، کە ئەویش خۆی دەبینێتەوە لەلادان (النفي) وە جێگیرکردن (الإثبات) دا کە هەموو جۆرەکانی پەرستن لادەدات کە بۆ غەیری الله ئەنجام دەدرێن، وە جێگیرکردنی هەموو جۆرەکانی پەرستن گشتی کە تەنها بۆ خوای تاك و تەنها و بێ شەریك و هاوبەش ئەنجام دەدرێن .

سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە بەنیعمەتەکانی چاکەکانی تەواو دەکات .
الله تعالی لەهەلە و کەموکورتییەکانمان ببورێت و نیەتمان خالص بکات